

# ژیان و خەباتی سیاسی
# د. ئەرسەلان بایز

## لەچاوپێکەوتنێکی مێژووییدا

چاوپێکەوتن:
**ئیسماعیل کوردە**

**چاپی دووەم**

# ژیان‌و خەباتی سیاسی د. ئەرسەلان بایز
# لە چاوپێکەوتنێکی مێژووییدا


- چاوپێکەوتن: ئیسماعیل کوردە
- ژانر: یادەوەری‌و سیاسیەت
- دیزاین‌و پیت چنین: نما
- بەرگ: ئاکار
- چاپی یەکەم: کوردستان، سلێمانی 2019
- تیراژ: 700 دانە
- شوێنی چاپ: چاپخانەی حەمدی 07701984746

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارە سپاردنی
(975) ساڵی 2019ی وەرگرتووە

# ناوەرۆك

# پێشەکی

پێنج بۆ شەش مانگێك دەبوو، بەندە کرابوو بە راوێژکاری مەکتەبی سیاسیی یەکێتی نیشتمانی کوردستان–هەولێرو رۆژانە لە ژوورەکەم دەوامم دەکرد، ئەگەر کارێکیش هەبوایەو پێیان راسپاردبایەن رامانده‌پەڕاند.

رۆژێکیان وا رێککەوت هەم بەندەو هەمیش کاك د. ئەرسەلان بایز–ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی لە ئۆفیسەکەی خۆی، بەیەکەوە گفتوگومان لەسەر ئەو پرۆژەیە کرد کە بۆ چی مادام من هەر لێرەم کارێکی وا ئەنجام نەدەینو رۆژانە بەپێی کاتی بەردەستمان پرسیار لەبارەی ژیانو خەباتی سیاسیو پێشمەرگایەتیو رووداوەکانی نێو شۆڕش نەکەینو وەڵامەکان بە ریکۆردەرێك تۆمار بکەین!؟

من پێموابوو، ئەمە هەم دەبێتە مێژووی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانو هەمیش دەبێتە هەڵدانەوەی لاپەرەکانی ئەو مێژووەو گێڕانەوەی لەسەر زاری کەسێکی وەکو "د.ئەرسەلان بایز" کە خۆی کارەکتەرێکی نێو ئەو مێژووەو رووداوەکانی بووە، بەڵکو کارەکتەرێکی کاریگەرو نزیکیش بووە لە بڕیارە سیاسیو چارەنوسسازەکانی شۆڕشو یەکێتی.

دیارە شتێکی شاراوە نییە، مێژووی خەباتی گەلی کورد پڕ هەورازو نشێوو سەختیەکی زۆرو زەوەند بووە، دەیانو سەدان رووداوی شاراوەو نەگوتراویشی تێدابوون. هەندێك لەو رووداوانە بەهۆی نەمانی کەسایەتیو کارەکتەرەکانی نێو ئەو مێژووە ونبوونو هەندێکیشیان بەهۆی بارودۆخی سیاسییو هەلومەرجی کۆمەڵایەتی بە نهێنی ماونەتەوەو نەچونەتە نێو لاپەڕەی کتێبو مێژووی کوردەوە.

گرنگی ئەو جۆرە چاوپێکەوتنو دیدارانە لەوەدایە، هەموو ئەو باسو خواسانەی کە نەنووسراون، یان ئەو کەسایەتیانە بەهۆی بارودۆخی سیاسیو کاروباری رۆژانەیان نەپرژاونەتە سەر نووسینەوەیانو بە دیکۆمێنت کردنیان بەئاسانی لەو جۆرە دیمانانەدا دەردەکەونەوەو رووناکی دەبینن.

لەو دیدارەماندا زۆر وێستگەی ژیانی ئەو کەسایەتیە سیاسیەی کوردو یەکێتی باسکراون، تیشکمان خستۆتە سەر سەرەتای خەباتی سیاسییو پێشمەرگایەتیو دروستبوونەوەی شۆڕشی نوێی گەلەکەمانو بەشێکی زۆری ئەو رووداوو سەرکەوتنو کارەساتو خەباتەمان شەنوکەو کردووەو بەپێی پێویست لێمان کۆڵیوەتەوە. پرسیارەکان رۆژانە هاتوونەتەپێشو بەشێکی زۆری وەڵامەکانیشمان دەستکەوتوونەتەوە.

رۆڵی کاریزماییانەی جەنابی مام جەلالو سەرکردایەتی سیاسی شۆڕشی نوێو کێشەکانی نێوان لایەنە سیاسیەکان لەشاخو مەسەلەی شەڕی براکوژیو رووداوە هەستیارەکان پەردەیان

لەسەر لادراوە..ویستوومە بەدوای حەقیقەتی شتەکاندا بگەڕێم..راستە لە زۆر شوێن راستیەکان خراونەتەڕوو، بەلاّم لەزۆر شوێنیش رەچاوی بارودۆخی سیاسیو هەستیاری دۆخی کوردستان کراوە. بەشێکیش لەو وەلاّمانەی تۆمارمان کردوون بۆ کاتێکی دیکە هەڵمانگرتوونو نەمانوویستووە تەواوی شتەکان بلاّوبکەینەوە.

لێرەدا سەردەمی شاخو پەیوەندی د. ئەرسەلان بایز بە جەنابی مام جەلالو کاك نەوشیروانو کاك کۆسرەتو د.بەرهەم خراونەتەڕوو..باس لە باڵەکانی ناو یەکێتیو هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانو کێشەکانی کوردستان لەدوای راپەڕین کراوە.

قۆناغەکانی خەباتی سیاسیو ئیداریو حکومی ئەو کەسایەتیە سیاسیە جێگای باسکردن بوونو بە پرسیارو وەلاّم وەرگرتنەوە روونکراونەتەوە.

لە بەشێکی تری ئەو دیدارەدا هەوڵمانداوە وەلاّمی هەموو ئەو قسەو باسو راو بۆچوونانە بدەینەوە کە لەبارەی ئەو کەسایەتە کراونو ویستوومانە لەسەر زاری خۆیەوە وەلاّمو حەقیقەتەکان ئاشکرا بکەین.

هەروەك بەشێکی ئەو پەیوەندییە سیاسیانەمان خستوونەتەڕوو کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەگەڵ حکومەتی عێراقو ولاّتانی دەوروبەر هەیبووەو د. ئەرسەلان بایز وەك کارەکتەرێك رۆڵی تێدا گێڕاون.

لەسەر ئاستی ناوخۆش پەیوەندییەکانی نێوان یەکێتی نیشتمانیو رێکەوتنەکانی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستانو کێشەکانی خراونەتەڕوو..هەر وەك راستی رێککەوتنی دەباشان لەگەڵ بزوتنەوەی گۆڕان روونکراوەتەوە. باسیش لە کۆنفرانسەکانی کۆمەڵەو کێشەکانیو جیابوونەوەی ئاڵای شۆڕش کراوە.

ماوەی سازادانی ئەو دیمانەیە زیاتر لە حەوت مانگی خایاندووە، لە مانگی 3ی 2019 دەستمان پێکردووەو لەمانگی 10ی هەمان ساڵ کۆتاییمان پێهێناوە. بەو هیوایەی لە ئایندەدا ئەگەر خوا تەمەن بدات، وردە وردە هەموو ئەو رووداوانەی ماونو باسمان نەکردوونو چەندین پرسیارو بابەتی دیکەش کە گرنگنو پێویست دەکات پەردەیان لەڕوو هەڵماڵینو قسەیان لەبارەوە بکەین، بەپێی بارومەرجی کوردستانو هاتنەپێشەوەی دەرفەتو هەلومەرجی بڵاوکردنەوەیان کاریان لەسەر بکەین.

ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوەیە بڵێین هیچ کارێك کە مرۆڤ بیکات بێ کەموکورتی نییە، لەوانەشە ئەو دیدارە تێری بابەتەکەو ئەو مێژووە دوورو درێژەی شۆڕشەکانی کوردو خەباتو کۆڵنەدانی پێشمەرگەی نەکردبێت..بەڵام هەمیشە کارکردنو بەدیکۆمێنتکردنی رووداوەکان بۆ ئێمەی کورد لە دەستەوەستان باشترەو ئومێد دەکەم ئەو کارەمان جێی خۆی بگرێتو رەخنەو پێشنیارەکانیش بێگومان لەبەرچاو دەگرین.

# سەردەمی منداڵی و
# قۆناغەکانی خوێندن

***لەو پرسیارەوە دەست پێدەکەین، ناوی تەواوت چیەو کوڕی کێی و لە چ شوێنێکی کوردستان لەدایك بووی؟**

–هەروەکو پووورم زێخە "زولێخا" دەیوت، لەمانگی حوزەیران، کاتێ باوکت و هەموو خێزانەکەمان چووبوون بۆ کشتوکاڵ و خەریکی دروێنە بوون، دایکم بەتەنها لەماڵ بووە من چاوم بەدنیا هەڵیناوە. هەندێ لە خزمەکانیشم بەپێی تەمەن دەڵێن: فلان لە تۆ گەورەترەو تۆ لە فلان گەورەتری، بەپێی ئەو تەمەنانە بێت، من لەساڵی 1950ی زایینی لەدایك

بووم، دایکم ناوی "مامز"ە، کچی کەریم ئاغای گوندی شۆڕیجەیە. باپیرەم ناوی ئیسماعیل محەمەد سادقە، دوو کوڕی هەبووە، یەکیان بەناوی بابیز کەوا براگەورە بووەو ئەویتریان بەناوی مەحمود. لەگوندی کاریتان جێگیربوون کە ماوەی کیلۆمەترو نیوێك لە شارۆچکەی دیبەگە دوورە.

ئێمە لەخێزانێکی بنەماڵەی دزەیین، خزمەکانم دەڵێن بنەماڵەی دزەیی لەکوردستانی ئێرانەوەو لەناوچەی دزیۆ مەرگەوەڕەوە بەهۆی ناکۆکی عەشایەریو هۆزەوە دوچاری شەڕوپێکداددان بوون و لەبەر ئەوە بەشێکیان لەبنەماڵەی دزەیی ئەو ناوچانەیان جێهێشتووەو هاتونەتە ناوچەی دەشتی هەولێرو دەستیان بەسەر زەویو زاری ئەو ناوچانەدا گرتووە، ئەوانە خۆیان سوارچاك بوون، مەڕوماڵاتیان هەبووە، چەکداربوون، دواتر بوون بەئاغای ئەو ناوچەیەی کە ئێستا بە دەشتی دەزییان دەناسرێت. بۆیە ئێستاش بەشێك لە خزمەکانمان لەناوچەی شنۆو نەغەدەو لە ورمێ هەرماون، پەیوەندیو هاتوچۆ لەنێوان خزمانی ئەو دیوو، هەولێر هەرماوە.

***ژیان و گوزەرانتان چۆن بووە؟ چەند خوشك و برا بوون؟**

–ژیانی ئەوسامان، ئەگەرچی باوکم و خێزانەکەمان موڵکیان هەبووە، بەڵام لەچاو خزمەکانی ترمان و ئاغاکانی ئەو ناوچەیە،

کەمترین موڵکمان بۆ ماوەتەوە. قانونی "اصلاح زراعی" لە ساڵی1953و دوای راپەرینەکەی جوتیارانی دەشتی دزەیی، وایکرد حکومەتی بێت و ئەو ناوچانە بەسەر جوتیارەکاندا دابەش بکات. بەڵام باپیرەم چونکە پیاوێکی دیندار بووە، لەوە دەچێ پیاوێکی کەمێك فەقیرۆکەش بووبێت.. وەکو خزمانی دیکە نەهاتووە زەوییەکە بەسەر منداڵ و کچ و کورەکانی دابەش بکات، هەر هەمووی بەناوی خۆی و باوکم هێشتۆتەوە. بۆیە "900" دۆنم بۆ ئێمە ماوەتەوە. کەچی خزمەکانی ترمان دوو، سێ هەزار دۆنمیان بۆ ماوەتەوە. لەگەڵ ئەوەشی کە باپیرم ئەو زەوییە زۆرەی بۆماوەتەوە، وەك پێویست نەیتوانیووە کشتوکاڵ بکات. لەبەر مەسەلە ئاینیەکە کەمتر بایەخی پێداوە. بۆیەش ئێمە ژیانێکی مامناوەندی دەژیایین. باوکم و مامیشم لەسەر رێگەی ئیمانداری باپیرم بوون. خەریکی نوێژو رۆژوو قورئان خوێندن بوون، باوکم قورئانی دەخوێند، بەڵام مام مەحمودم نەخوێندەوار بوو. باوکم تا شەشی سەرەتایی، سیەکانی سەدەی رابردووی خوێندبوو، ئەو سەردەم قوتابخانە لە دیبەگە کراوەتەوەو ئەویش خوێندوویەتی. دیبەگە لەناوەراستی ساڵی بیستەکان بۆتە ناحیەو لەکۆتایی بیستەکانیش قوتابخانەی تێدا کراوەتەوە. بۆیە باوکم لەگەڵ چەند کەسێکی هاوتەمەنی خۆی چۆتە مەکتەب. بەڵام وەك نەریتی ئەو ساکە خوێندن زۆر باوی

نـەبووە، یـان خۆیـان نەیانخوێنـدووە، نـەیتوانییوە شەشـی سەرەتایی تێپەڕێنێت.

بەو حیسابە بێت من لە بنەماڵەیەکی ژیان مامناوەندی، نێـو بنەماڵەی دزەیی لە گوندی کاریتانی سەر بە ناحیەی دیبەگـەو سەر بەقەزای مەخموورو سـەر بـەپارێزگای هـەولێر" کـە ئێسـتا پایتەختی کوردستان"ە، لەدایك بووم.

ژیـانی منـداڵیم، ژیـانێکی رەفاهیـەت نـەبوو، ژیانێـك بـوو هەنـدێك لـە خـەڵکی گوندەکـەمان باشـتر ئـەژیایین، بـەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەو زەمانە رەفاهیەتی تێدا نەبوو. هەندێ لە خزمەکانمان لە ئێمـە دەوڵەمەنـدتر بوون..لـە سـاڵانی چـلو پەنجاکانـدا خـانوو، سـەیارەیان هـەبوو، بـەڵام ئێمـە ژیـانێکی مامناوەندو شتێك باشـتر لـە جوتیارەکـان ژیـاوین. پەیوەنـدی بـاوکمو مـامم لەگـەڵ خـەڵکی گوندەکـە پێوەندییـەکی زۆر دۆستانە بوو..بۆیـە ئێمـەش لەسـەر نـەریتو بەرنامـەی ئـەوان پێوەندیـەکی زۆر باشمـان لەگـەڵ هاوتەمەنـەکانی خۆمـان لـە گوندی کاریتان هەبوو.

ئێمە لـە خێزانـی خۆمانـدا چـوار بـراو یـەك خوشـك بـووین، براکانمـان ناویـان "کـەمالو عـەلی بـەگو ئیـبراهیمو خـۆم" خوشکەکەشمان ناوی "شعلە"یە.

***سەردەمی منداڵیت لە گوندی کاریتان چۆن بووە؟ چ یادگارییێکت لەو سەردەم بیرە؟**

–ئێستا دێتەوە بیرم، ئەوکاتە بەسەردەمی زێرینی تەمەنی خۆم ئەزانم، لەگەڵ گەنجەکانی گوندەکامان لەوانە"یابە عومەر، ئەحمەدی حاجی حوسێن، عەبدوللای مام روال، کەمال حەسەن، ئەحمەدی کوڕی مام مەلودی، تاهیری دەروێش عەزیزی..."، ئیتر ئێمە هاوتەمەن بووینو وەك کۆمەڵێك منداڵ، سەردەمی منداڵی خۆمان بەیەکەوە بەسەر بردووەو بەیەکەوە گەورەبووینو، هیچ جیاوازییەك لەنێوان ئێمەماناندا نەبووەو وەکو براو یەك خانەوادەی گوندێك بووین.

ئەوسا گوندەکەمان چل بۆ پەنجا ماڵێك دەبوو.. لەساڵی 1958 کاتێك عەبدولکەریم قاسم شۆڕشی کردو سیستەمی پاشایەتی نەهێشتو کوشتو بڕی بنەماڵەی پاشای دەسەلأتداری ئەو کاتەیان کرد، من لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی بووم.. پاشای ئەوکاتی عێراق مەلیك فەیسەڵ بوو، نوری سەعیدیش سەرۆك وەزیران بوو.

ئەوسا لەدێیەکەمان تەنها رادیۆیەك هەبوو، ئەویش هی ماڵی محەمەدی عەبدوڵلا سەعدون بوو. محەمەد پیاوێکی زۆر وریاو ئەندامی حزبی شیوعی عێراق بوو، کەسێکی هەڵسوڕاو بوو. بە هۆی زیرەکیو وریایی خۆیەوە توانیبووی لە گوندەکە سەرقافڵەی هێنانی رادیۆبێت. کە بەیانی شۆڕشی 1958و

کودەتای عەبدولکەریم قاسمیان بلاّوکردەوە، من منداڵ بوومو لەگەڵ خەڵکی گوندەکەمان لەماڵی"محەمەد" گوێمان لەهەواڵەکە گرت. بەس خۆ نەماندەزانی مەسەلەکە چییە. سەیرمان ئەکرد جیهازێکی بچووك دانراوەو قسەدەکات، ئێمە وەکو منداڵ پێمان سەیربوو ئەو سنووقەدارە قسە دەکات. دەمانگوت تۆ بلّێی ئینسانێکی بچووك لەناو ئەو سندوقە بێتو قسە بکاتو ئەبێ چۆن جێی لەوێ بووبێتەوە. خۆشتان دەزانن رادیۆی جاران دەبوایە پاتریەکی گەورەی هەبێتو بە تەلێکەوە بە ئامێری رادیۆکە ئەبەسترا‌و لەسەربانەکەش ئەبوایە دوو داری بۆ بچەقێنین‌و دارەکەش تەلی پێوە بێت.

کاتێك رادیۆ لە گوندەکەمان پەیدا بوو ئەمە بۆخۆی گۆڕانکاری بوو، وردە وردەش خەڵکی زانیان شتێك هەیە بەناوی رادیۆو لەدوورەوە کابرا قسە دەکاو خەڵك گوێی لێ دەبێ. دووەمین رادیۆش لە کاریتان هی ماڵی ئێمە بوو، باوکم رادیۆیەکی کڕی مارکەکەی پێی دەگوترا"سیرە". ئێمەش ئەوسا کە منداڵ بووین زۆر کەیفمان پێی دەهاتو هەموومان ئەچووینە سەر بانەکەو تەلمان بۆ هەڵدەبەست. بەو شێوەیە دواتر خەڵکی تریش کڕیان‌و بەهۆی بلاّوبوونەوەی فیکری شیوعیش لەدوای کودەتای 1958، رادیۆی زیاترو جۆری زیاتریش پەیدا بوون.

***کەی چوویە بەر خوێندن و ئایا قۆناغەکانی خوێندنت تا کوێ لە دیبگە بڕیون؟ چ ساڵێك بۆ خوێندن چویتە زانکۆ و لەکوێ؟**

–من لەتەمەنی حەوت ساڵیەوەو لەدیبەگە چوومەتە قوتابخانەو قۆناغی سەرەتایم لەوێ دەستپێدەکات. دەبوایە هەموو بەیانیەك سعات حەوتو نیو بەڕێ بکەوین، سەرماو گەرما بوایە، ئەبوایە بڕۆینە دیبەگە. ئەو ساڵانە وەکو ئێستا نەبوو، دنیا ساردتربوو، جاری وا هەبوو لای ئێمەش بەفر دەباری، ئەوە بارانیش هەر هەبوو. بەڵام ئێمەی منداڵ لەو سەردەمدا نەچەترو نەپێڵاوی باشمان هەبوو. جاری واهەبوو مامی رەحمەتیم کە لەباوکم باشتر بوو بۆمان، زۆر ئاگای لێمان دەبوو، خزمەتی ئەکردین و رێنمایی ئەکردین و چاودێری دەکردین. بیرم دێت جاری وا هەبوو کە منداڵ بووم مام مەحمودم بەسورای ولاغ من و حاجی برایمی برام و هەندێ جاریش "عەدۆ"ی کوڕی خاڵم کە ئەوسا لە ماڵی ئێمە دەیخوێند، لە پشتی خۆی سوار دەکردین و ئەیبردین بۆ مەکتەب.

یەکەم مودیری مەکتبم ئەوسا ناوی "نووری ئەفەندی" بوو، نوری ئەفەندی ئەوساو لەسەرەتای کردنەوەی مەکتەب لە دیبەگە لەگەڵ باوکم خوێندبووی، باوکم وازی هێنابوو، نووری ئەفەندیش بەردەوام بوو، ببووە مامۆستاو دواتریش لەهەمان

مەکتەب ببووە بەڕێوەبەر. پیاوێکی زۆر توندبوو لە خوێندن، جدیو ئیشەکانی بەگرنگ وەردەگرتن.. تەڵەبە هەموو لێ دەترساین. لەڕووی قانونیو چوارچێوەی زانستیەوە مەکتەبەکەی دامەزراندبوو. بۆیە هەموومان قەرزداری مامۆستا نوری ئەفەندین. لە پۆلی یەکەمی سەرەتاییەوە مامۆستایەکم هەبوو ناوی "سەعدوللا"و کریستیان بوو، زۆر لێی ئەترسام، جاری وا هەبوو کە دەرسمان نەدەزانی، نەك هەر لێی ئەداین، دەیگوت زلەیەکت لێ بدەم سەری خۆت لەناو ئەو قوڕاوەی دەرەوە دەبینیەوە. ئەو ترسە لام زۆر غالب بوو، بەو هۆیەشەوە ساڵی یەکەم دەرنەچووم. کە هاتمەوە باوکم زۆر لێم تووڕە بوو، وتی چۆن دەرنەچووی، گوتم من لەو مامۆستایە دەترسمو نامەوێ بچمەوە ئەو مەکتەبە. بەهەرحاڵ بەهۆی ڕێنمایی باوکم کە تا شەشی سەرەتایی ئەوسای خوێندبوو، ئاستی خوێندنەکەشی لەڕووی بیرکاریو کوردیو عەربیو شتی لەو بابەتانە باش بوو، یارمەتی دام ساڵی دووەم بە پلەیەکی زۆرچاك دەرچووم.

ئەو ساڵانەی من لەسەرەتایی بووم، باوی مقاوەمەی شەعبی بوو، ساڵێك دوای کودەتای عەبدولکەریم قاسم بوو. ئێمە وەکو بنەماڵەی ئاغا زەختێکی زۆرمان لەسەر بوو، بەشێك لەخزمەکانمان لەترسی پەلاماری مقاوەمەی شەعبیو شیوعیەکان دێهاتەکانی خۆیان بەجێهێشتبوو، بۆنموونە

لەشاری دیبەگە کە مەرکەزی خزمەکانی ئێمە بوو، سلێمان ئاغا رەسول ئاغا کەوا برا گەورەی بنەماڵەی ئێمە بوو، ماڵەکەی گواستەوەو چووە کەرکوك. هەروەها خاڵم کەناوی مەعروف کەریم بوو، ئەویش چووە کەرکوك‌و لەوێ خەریکی کاسبی بوون. بۆیە ئێمە لەدیبەگە کەم مابووینەوە، تەنها ماڵی ئێمەو کاك ئەحمەدی حەسەن ئاغا مابوونەوە.

مەترسیەکەمان هەر لەسەر بوو، جارجارەش کە دەچووینە قوتابخانە، لەلایەن شیوعیەکانەوە ئازاردەدراین، یان قسەیان پێدەگوتین، بەڵام هەرچۆنێك بوو ئیدارەمان کرد. من قۆناغەکانی سەرەتایم بەباشی بڕین‌و ساڵانە لەگەڵ قوتابیەکانی پۆلەکەی خۆم بەتایبەت یەکێکیان بەناوی سیامەند تاهیر لە کێبڕکێی خوێندن دابووم.

قۆناغی سەرەتایی‌و ناوەندی خوێندنم لە دیبەگە بەرێکرد.. پەیوەندیم لەگەڵ خویندکارە هاوتەمەنەکانم زۆرباش‌و بەرفراوان بوو. تەڵەبەیەکی مامناوەندی بووم لەمەکتەب..بەڵام لەبیرکاری زۆرباش بووم. هەفتەی دوو،سێ جار لەگەڵ برادەرکانمدا بۆ یاری باڵەو باسکە ئەچووینە دیبەگە، لەوانەش "مەحموودو مام وسوو، کوراڼی عوسمان مەحمود بوون، عەدۆی کوڕی خاڵم‌و عوسمان حەسەن‌و واحید ئەحمەدو حەسەن قوشاغلۆیی‌و هەمزە خدر".

***ئەی خوێندنی ئامادەیت لەکوێ خوێند، خۆ ئەو کات دیبەگە ئامادەیی لێنەبوو؟**

-تاقیکردنەوەی سێی ناوەندیم لە هەولێر کردو بەهۆی مانەوەم لەدەرسی ئینگلیزی بە خولی دووەم دەرچووم. دواتر چومە دواناوەندی هەولێر کە ئەوسا تەنها پۆلی چوارو پێنجی هەبوو. لەوێ لەگەڵ عەلی برام و ئیسماعیل عەلی باپیر کە خەڵکی گوندی سیاو بوو، ژوورێکمان لە گەڕەکی تەعجیل گرت.

ژوورەکە لەقاتی دووەمی خانوویێك بوو، سەربانیشی نەبوو، بۆ سەرئاو دەبوایە بچینە مزگەوتی مەلا ساڵحی کۆزەپانەکەیی و ئەویش پەنجا مەترێك لە شوێنەکەمان دوور بوو. ژیانێکی قورس و کولەمەرگیمان بەسەر ئەبرد. بیرمە جارێکیان چووینە "حەمام مۆدە" کەوا دووسەد مەترێك لە ژوورەکەمان دوور بوو..هاتینەوە زۆرمان برسی بوو، عەلی براشم نیسکێنەی لێنابوو، زۆر باش خواردمان بەڵام کە تەواو بووین عەلی برام گوتی خۆ روونیشم تێنەکردبوو. هەفتەی جارێك نانی رەق و ماستمان لەماڵەوە بۆ دەهات. شوێنەکەمان بەپێیان بیست دەقەیەك لە ئامادەیی هەولێر دوور بوو.

# تێکەڵبوون
## بە بزوتنەوەی سیاسیو کاری حیزبایەتی

*یەکێك لە گۆڕانکارییە مێژووییەکانی عێراق کودەتای 1958 بوو، کاریگەری ئەو کودەتایە چی بوو، هیچ بزوتنەوەیەکی سیاسیی یان حزبی ئەو کات لە ناوچەکەی ئێوەدا هەبوو؟

-دوای ساڵی 1958، بیروباوەڕی شیوعیەت گەشەی کرد، دواتریش ململانێی پارتیو شیوعی لە دێکەمانو لەناوچەکەش بەگشتی سەریهەڵداو بووە هۆی ئەوەی جموجۆڵ لە ناوچەکە پەیدا ببێت. بەڵام حزبی شیوعی ئەوکاتە زۆر بەهێزتر بوو لە پارتی، ژمارەی ئەندامەکانی هەمیشە لەزۆربووندا بوونو هەڵسووڕاوو کادیریان زیاد دەبوون. لەلایەکی دیکەشەوە بەحوکمی ئەوەی دەنگو سەدای شۆڕشی بەلشەفیو شۆڕشی ئۆکتۆبەرو حزبی شیوعی رووسیو سەرکەوتنەکانی بڵاو دەبوونەوە.. وایکردبوو حزبی شیوعی زۆر بەهێزبێتو لە هەموو دێهاتو شارو شارۆچکەکانی ئەو ناوچەیە بارەگایان هەبێتو "مقاوەمەی شەعبیان" دروست کردبوو. حزبی شیوعی بەهۆی ئەوەی لەڕووی چینایەتیەوە دژی بۆرژوازیەتو

دەرەبەگو ئاغاکان بوو لەناوچەی ئێمە گەشەی بەردەوامی دەکرد.

جوتیارەکان لەبەردەمی ماڵە ئاغاکان خۆپیشاندانیان ئەکردو دروشمیان ئەکێشاو ئەیانگوت"ئەمە چییە لە قۆڵم، چاوی ئاغای ئەکۆڵم. سنی نییە فافۆنە، چەلاوخۆر چاوی مۆنە"و کۆمەڵێك دروشمی لەو شێوەیەیان ئەداو پەتیان هەڵدەشەقاندو دەیانگوت بۆ ملی ئاغاکانەو بەو پەتانە راتان ئەکێشین. بۆیە ئاغاکان مەیلیان بەلای پارتیدا دەڕۆیشت. من منداڵ بووم لە دیبەگە دوو بارەگا هەبوون، بارەگایەکیشان هەر چایەخانەیەك بوو، هیچیتر. یەکێکیشیان بارەگای حزبی شیوعی بوو کە بەرەسمی بارەگای حزب بوو، ئەمان ئیمکانیەتیان زیاتر بوو. سەیفەددینی حاجی برایمیش کە لە بنەماڵەیەکی ناسراوی دیبەگە بوو، بەرپرسی ئەو بارەگایە بوو. لەوێدا قەڵەباڵغی زۆر هەبوو، خەڵکیان زیاتر کۆدەکردەوە.

بەلام بارەگای دووەم، وەك بارەگا نەبوو، چایخانەکەی "ئەحمەد مەحمود"بوو، ئەحمەد لەدایکەوە لەگەڵ باوکم خزمایەتیان هەبوو، پورزای یەکتر بوونو دایکیان خوشك بوون یان ئامۆزا بوون. بۆیە بەحوکمی خزمایەتیو منداڵیمو شتەکەش وابوو شیوعیەکان دژی ئاغاو موڵکدارەکان بوون، بۆیە بە ئاسایی من مەیلم بەلای پارتیدا دەشکایەوە. وەك

منداڵێك بەبێ ئەوەی بزانم ئەو شیوعییە چییە؟ یان ئەو پارتییە چییە؟ دەچوومە چایخانەکەی ئەحمەد مەحمودی. خزمێکی تریشم کە ناوی مەحمود سەلمان بوو، رێك پوورزای باوکم بوو، یەکێك بوو لە کادیرە ناسراوەکانی پارتی‌و کە دەچووینە ئەوێ، ئەوان بانگی لای خۆیان ئەکردین‌و بەحوکمی خزمایەتی سەردانی ماڵیشمان دەکردن.

***تێکەڵ بوونت بە چالاکی سیاسی‌و خەباتی کوردایەتی بۆ کەی دەگەڕێتەوە؟ هیچ هۆکارو پاڵنەرێك هەبوون، تا ئەو هەستەت لا دروست بکات‌و بکەویتە چالاکی سیاسیانە؟**

–کاتێك بوومە پۆلی پێنج‌و شەشی سەرەتایی، کەماڵی برام کە چوار ساڵ‌و عەلی بەگی برام کە دوو ساڵ لەمن گەورەتر بوون، بۆ خوێندنی ناوەندی چوونە ماڵی خاڵم لەکەرکوك، خاڵم تەنها کوڕێکی بەناوی"عەبدڵڵا" هەبوو، لەخۆشەویستیان پێیان دەگوت "عەدۆ" زۆر خۆشەویست بوو لامان‌و لە قۆناغەکانی سەرەتایی بەتایبەت لە پۆلی یەك‌و دوو لەماڵی ئێمە دەیخوێند. چونکە خاڵم خەڵکی گوندی شۆریجە بوو، گوندەکە چارەکە سعاتێك بە ئۆتۆمبیل لە دیبەگە دوور بوو، مەکتەبیشی لێ نەبوو. بۆیەش عەدۆ هاتە ماڵی ئێمە. خاڵیشم چونکە دایکم تاقە خوشکی بوو، زۆر موراعاتی دەکرد، لەبەر کوڕەکەشی‌و هەمیش لەبەر ئەوەی ئێمەش خوارزای بووین ئاگای لەئێمەش دەبوو. بەڵام کە ماڵی چووە کەرکوك، ئیتر

عەدۆش چۆوە ماڵی خۆیانو لەوێ خوێندیو دواتر براکانیشم چون لەوێ لە ناوەندی شەرقییە خوێندیان.

منو عەلی برام لە گەنجیدا زۆر هاوڕێو متووی یەکتر بووین، یەکێك لەسەفەرەکان کە عەلی برام هاتەوە، شتێکی لەنێو نیفۆی پانتۆڵەکەی دەرهێنا، بینیم وەرقەیەکی بچووکە. منیش گوتم ئەمە چییە؟ گوتی وەرەقەیە هی "یەکێتی قوتابیانە".. پرسیم جا ئەمە چییە؟... ئیتر بۆی باس کردم.

عەلی برام لە قۆناغی ناوەندی لەکەرکوك چووبووە ریزی"ی.ق.ك"و ئەوسا بۆ ئاگاداری پێشمەرگە وەرقەی رێپێدانیان بۆ دروست دەکردن، تاوەکو لەهاتوچۆکردندا ئازاد بن. عەلی برام وەرەقەیەکی وای پێبوو، تیای نوسرابوو ئەندامی ئێمەیەو لەکاتی کێشە هاوکاری بکەن. ئەو خەبەرەی عەلی برام بۆی باسکردم وەك زەنگێك لە مێشکم دەنگی دایەوە. بۆی باسکردم کە "ی.ق.ك" پەیوەندی قوتابیانی کورد بەیەکەوە دەبەستێتەوەو ئیش بۆ میللەتی کورد دەکات. گوتم چۆن؟ ..گوتی ئێمە سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستانین. ئیتر لە عەلی برامەوە فێربووم کە حزبایەتی چییەو "ی.ق"و شۆڕشو میللەتی کوردو پێشمەرگەو خەبات چییە؟

لەبنەڕەتدا ئێمە بنەماڵەیەکی محافزکاربووین، پێشتر بەلای حزبایەتیو شتی وادا نەچووبووین، حزبایەتی لەناو بنەماڵەی

ئێمە کە "بنەماڵەی مامەخولەیین"، نەبوو. بەڵام خزمەکانی تری بنەماڵەی دزەیی کە وەختی خۆی کوڕەکانیان لەبەغدا لە کۆلیژی یاسا بوون، لە سیو چلەکانەوە، کاتێ دەهاتنەوە بیروباوەڕی کۆمۆنیستیان وەرگرتبوو، دەیانهێنایەوە بۆ گوندەکانی خۆیانو تەنانەت ئەو کوڕە ئاغایانە هانی جوتیارانیان ئەداو دەیانگوت بە قسەی ئاغا مەکەن، ئاغاکان باوکی خۆشیان بوون. دەیانگوت بەقسەی باوکمان مەکەن ئەوان دەتان چەوسێننەوە. بۆیە "عەلی بەگ" یەکەم کەس بوو کە سیاسەتو حزبایەتی هێنایە ناو بنەماڵەی ئێمەوە. لەدوای ئەو من فێری سیاسەت بووم.. بەڵام لە دیبەگە هیچ شتێك نەبوو تا بچمە ناو یەکێتی قوتابیان.. لەراستیدا منداڵیش بووم.

***جگە لەعەلی بەگی برات کێیتر کاریگەری بەسەرەتەوە هەبوو؟**

–ئەوەی زیاتر هەستی کوردایەتی لا چەسپاندم، مامۆستایەکم بوو بەناوی"وەهاب" خەڵکی کۆیە بوو، دەرسی کوردی پێ دەگوتین..هەر کە دەهاتە پۆلەکەوە دە دەقەی یەکەم، یان کۆتایی دەرسەکە، باسی کوردو پێشمەرگەو شۆڕشو بارزانی رەحمەتی دەکردو سرودی کوردیشی فێر دەکردین. ئێمەش وامان دەزانی ئەمەش دەرسە فێرمان دەکا.

رۆژێك وتیان مامۆستا وەهاب رایکردووە ! من لـەکاریتان بـووم کە هەواڵی راکردنەکەی گەیشت و گوتیان لەبەر "قوەی سەیار" رایکـردووە. قـوەی سـەیار ئـەو سـەردەمە هێزێکـی گـەرۆکی پۆلیس بوو.

ئێمە هەر لەخۆڕاو لەگەڵ کۆمەڵێك برادەر گوتمان کوا..کواو بەدوایـدا رامـانکرد. ویسـتمان بـزانین ئـەو لـە کوێیـەو بـۆ رایکردووە.. کە بەدوایداچووین لە پشتی زوورگـەکانی کاریتـان لەگەڵ چەند کەسێکی تر دانیشتبوو، لـەبیرم نایـە کـێ بـوون.. پێمانگوت بۆ هاتوویی و بۆ لێرەی؟ گـوتی ئێـوە بـۆ هـاتوون.. گوتمان خەڵکی گوتیان مامۆستا وەهاب رایکردووە و ئێمەش کە قوتابی تۆین هاتین بـۆ ئـەوەی بـزانین بـۆ راتکـردووە.. گـوتی لەبەر ئەو قوەی سەیارانە رامکردووە.

لەسەر ئەو گردە ئێمەی دانیشاندو کیسـەیەکی بەدەسـتەوە بوو، چەندین نوسراوو رەسمی تێدابوون. گوتـی.. مـن ئەنـدامی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتانم ئـەم بڵاوکراوانـە هـی پـارتی و پێشـمەرگەیە..رەسمی بـارزانی رەحمـەتی و مـام جـەلالی رەحمەتی تێدابوو.. بیرمە رەسمی مام جەلال لەگەڵ مارگرێت و یەکێکی تردا بوو. ئەوسا واباو بوو، کلێتەکیان لەسەر دەکـردو پوزەوانە "بەلەکپێچ" یان ئەبەست و برنۆو قوتە برنـۆو خەریتـەو رەختەیان ئەبەست. ئەو رەسمـە ئەوەنـدە جـوان بـوو لامـان و لای منـیش هـەر زۆر جـوان و کاریگـەر بـوو. لـەو سـاوە

خۆشەویستیم بۆ ئەو پیاوەو شۆرشو پێشمەرگە پەیداکرد..لەوێوە تێگەیشتم کە ئینسان ئەبێ کار بۆ میللەتو ولاتەکەی خۆی بکات.

ئیتر لەدوای بینینی بلاوکراوەکانی پارتیو وێنەکانی لای مامۆستا وەهاب..زیاتر مەسەلەی نەتەوەییو کوردو کوردستانو پێشمەرگەو شۆڕش لەلام چەکەرەی کرد. بەلام ئەو چەکەرەکردنە وەك تەقینەوەیەك لەدوای کودەتای بەعس بەسەر عەبدولکریم قاسم وەدەردەکەوێ. کاتێك تاقیکردنەوەی بەکالۆریی شەشی سەرەتایمان لەدیبەگە ئەکرد.. لەهۆلی تاقیکردنەوەکان لەبەر دەنگی تۆپخانەو زنجیری تانکەکانی حکومەتی عێراقی هەراسان ببووینو نەمان دەتوانی باش بیر لە پرسیارەکان بکەینەوەو وەلامیان بدەینەوە. چونکە هێزێکی گەورەی عەشائیری عەرەبیو سوپا بەپشتیوانی فرۆکە پەلاماری بنکەکانی هێزی پێشمەرگەیان لەچیای قەرەچوغ دەدا. چیای قەرەچوغ دەکەوێتە نێوان دەشتی قەراج، واتا مەخموورو ناحیەی دیبەگە. بیرمە هێزەکەی حکومەت دوای چەند سعاتێك شەڕ شکا. کە بەشکاوی گەڕایەوە، چەکدارانی عەشائیری عەرەبی پەلاماری دێهاتەکانیانداو هەرچیەکی دەستیان دەکەوت بەتالانیان برد.. لەمەڕو مالاتو ئالتونو پارەو هەتا قەلو قازو مریشکیشیان دەبرد. من ئەم رووداوەم بەچاوی خۆم بینیووە. ئەو رۆژە لێشاوێکی زۆری خەلك

لەترسی ژیانی خۆیان ئاوارەبوونو هاتنە دیبەگەو دێیەکەی خۆمان.. بیرمە ئەو رۆژە لەگەڵ باوکم چووینە ماڵی کاك ئەحمەدی حەسەن ئاغا کە دەیکردە ئامۆزای باوکمو لەوێ کۆببوینەوە..دەماندیت عەشائیری عەرەب بەدوکانو بازاڕی دیبەگە وەربوونو ئەوەی دەستیان کەوت تالانیان کرد. سعاتیان لەدەستی خەڵك دەکردەوەو گیرفانیان تالان ئەکردنو قاسەی دوکانەکانیان ئەشکاندنو دەیانبرد..وای لێهات یەك کەس لەترسان لەبازاڕ نەما. ئەو چەکدارانە جارجارە تەقەیەکیشیان ئەکرد، دواتر نەك هەر بازاڕ پەلاماری هەندێ ماڵی نزیك بازاڕیشیان داو تالانیان کردن. کە ئێوارەکەی هاتینەوە ماڵی خۆمان، بینیم هیچ ماڵێك لە گوندەکەمان نییە ماڵی ئاوارەی وەخۆ نەگرتبێت. بەس حەوشەی ماڵی ئێمە کە توزێك گەورەبوو، زیاتر لە بیستو پێنج بۆ سی ماڵی تێدابوو..ژنو منداڵ، گەورەو پیرو پیاو..خێزانی واهەبوو منداڵیان ون ببوو، خێزانی وا هەبوو لەترسی رۆحیان ژن لەشوێنیو پیاو لەشوێنی، کچو گەنج لەشوێنێو دایكو باوك لەشوێنێکی تر.

ئەو رووداوە وەك چۆن نەخشی هونەرمەندێك لەسەر بەرد ساڵەهای ساڵ دەمێنێتەوە، ئاوەها لەمێشكو رۆحو دڵی مندا نەخش بوو. هەموو ئەوەی عەلی براشم لەبارەی قوتابیانو شۆڕشو پێشمەرگەو رەسمەکانی بارزانی رەحمەتیو مام

جەلال"بەکڵاوە کلێتەیەکەی"و مارگرێت بەتفەنگەکەی لەشانیم هەر لەخەیاڵ بوون. وەك گەنجێكو هەرزەکارێك ئەو مەسەلانە لەلام زیاتر چەکەرەیانکرد، بەڵام دیبەگە نە قوتیابیانو نە بارەگای پارتی لێنەبوو، ئەوکات پارتی قەدەغەبوو، پێشمەرگە دەبوو بەپارتیزانی ئیش بکەن..من تەنها خۆشەویستیم بۆ پیشمەرگەو میللەتەکەمو شۆڕش هەبوو. ئەو رقەی لام دروست بوو، بەرامبەر ئەو غەدرو تالانیەبوو کە عەشائیری عەرەبی کردیان..ئینجا گریانو نوزەی ئەو منداڵانەی بەهۆی ئاوارەییەوە بێ شوێن ببوون هەرگیز لەبیرم نەدەچووەوە.

ئیتر وایلێهات نەمانتوانی بەئاسانی تاقیکردنەوەکان تەواو بکەین..بەرێوەبەری هۆڵەکە پەیوەندی بە پەروەردەی هەولێرکردو ئەزموونەکان بۆ ئەوێ گوازرانەوە. من چوم هوتێل سەندبادم گرت، دەکەوتە خوار قەڵاتێ، لەوێ ماومەوە تا تاقیکردنەوەکانم تەواوکردن. دواتر کە گەڕامەوە بینیم گوندەکانی ناوچەکە هەموو بوون بە عەرەب نشین.. لەدوای کودەتای بەعس عەشائیری "بەدو"ی عەرەبی هاتنە ئەو دێهاتانەو نیشتەجێبوون. زیاتر لەبیست بۆ سی گوندی ئەو ناوچەیە چۆڵکرانو کوردەکان هەڵاتنو عەشائیری عەرەبی بەسەرۆکایەتی "حەواس سدێد"ی سەرۆك هۆز لێیان داکوتا. ئیتر ئەوان زەوییەکانیان تۆ ئەکردو زەویەکانیان دەکرد بەکشتوکاڵو هاوینیانیش ئەیاندوریەوەو هەرچی موڵكوماڵی

ئـەو ناوچـەیە هـەبوو بـوو بـەهی ئـەوان. عـەرەب هاتنەسـەر سنووری دێکەی ئێمەو ناحیەی دیبەگەو رۆژانە بەریـەك کـەوتن روویـدەدا..رووداوەکان وەك فیلیمێـك لـەلای مـن لەسـەر دڵو مێشکم دەنەخشان.

***چۆن یەکەمجار تێکەڵ بەکاری سیاسیی بوویت؟**

–عەلی برام برادەرێکی هەبوو بەناوی کـاك جـەلال، خـەڵکی گوندی دووشیوانی سەربە ناحیەی کەندیناوە بوو.. ئـەوان زۆر بەیەکەوە بوونو چرپە چرپیان دەکـرد. منـیش وەك کەسـێکی خۆتێهەڵقورتێن، گوتم ئەوە چییە ئـەو چـرپە چـرپە دەکـەن.. گوتیـان ئێمـە هـەردووکمان ئەنـدامی پـارتین–بـاڵی مەکتـەبی سیاسی. مـن نەمـدەزانی بـاڵی مەکتـەبی سیاسـیو ئـەویتریش چییە. بەڵام من بە عەلی برام سـەرسمام بـوومو ئـەویش کـاری سیاسـیـەتو قوتابیـانی دەکرد..کـاك جـەلالی برادەریشـی کەسێکی وریاو لێهاتووبوو. لەرێی ئەوانـەوە بـووم بـە ئەنـدامی پارتی دیموکراتی کوردستان–باڵی م.س"و "ی.ق.ك". یەکـەم هەنگاوی سیاسی من لـەو رۆژەوە دەسـت پێـدەکات، واتـا کـە پۆلی چوارەمی ئامادەیی هەولێر بووم.

مـن وەك گـەنجێك بزێـو بـوومو حـەزم لـە خوێندنـەوە بـوو، سەرەتای خوێندنەوەم بە شیعری شاعیران دەستپێکردو دواتر کتێبەکانی وەك خورشیدو خاوەرو ئـەمیر ئەرسـەلانو شـیرینو

فەرهادم خوێندنەوە. کە بووشمە ئەندامی پارتی، چالاك بووم‌و حەزم لەسیاسەت بوو. سەرەتا لەشانەیەکیان لەگەڵ" عـەزیزی ئەنوەر چۆخین‌و سابیر محمود" دانام هەرسێکمان ئەندام شانە بووین‌و کەسێکیش ناوە ناوە دەیبیـنین. بـاوکی عـەزیز یـەکێك بـوو لـە کـادیرە کـۆن‌و تێکۆشـەرەکانی پـارتی دیمـوکراتی کوردستان، بەئەسڵ خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردستان بوون. بیرمە جارێکیان کۆبوونەوەیەکمان لەپشت قوتابخانەی جمهوری کرد ئـەو کـات ئـەوێ چـۆڵایی بـوو. بڵاوکراوەکـانی پـارتی بـاڵی مەکتەبی سیاسیمان ئەخوێندنەوە. بەڵام بەداخەوە دواتـر ئـەو دوو باڵەی پارتی بەینیان خـراپ بـوو، لەهـەولێر تەقـەیان لێـك دەکـردو لێکیـان دەکوشـت. بۆیـە بـارودۆخی ئێمـە روو لـە نالەباری بوو. بـەڵام هـەر بەقەناعەتـەوە ئیشـمان بـۆ باڵەکـەی خۆمان دەکرد.

بەمشێوەیە ئامادەیم تەواوکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی نمرەکەم کـەمبوو ئـەو سـاڵە لـە زانکـۆ وەرنـەگیرام. دواتـر دەورەیـەکی بـــەهێزکردنیان لـــە پـــەیمانگای پێگەیانـــدنی مامۆســـتایان بۆکردینـەوەو بۆسـاڵی دواتـر داواکـاریم پێشـکەش بـەزانکۆی بەغدا کـردو لـە بەشـی کـوردی کۆلێـژی ئـەدەبیات وەرگـیرام، ئەوسا بەهۆی بـاڵی مەکتـەبی سیاسـی پارتیـەوە"270" کـەس لەبەشی کوردی وەرگیران‌و یەکێك لەوانیش من بووم.

## شۆڕشی ئەیلولو
## ڕێکخستنە نهێنیەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران

***تۆ ئەگەر کۆمەڵە بویت چۆن پەیوەندیت بە شۆڕشی ئەیلولەوە کرد؟ کارکردنتان لەنێو شۆڕشی ئەیلولو بەناوی ڕێکخستنی ترەوە چۆن بوو؟**

-کاتێك لە ئۆردووی سەربازی "محاویل" سەربازبووم، سەردانی کاك سالار عەزیزم کرد لە بەغداد، کاك سالار بەرپرسی کۆمەڵەم بوو. لەوێ بڕیارماندا پەیوەندی بەشۆڕشەوە بکەین. پاش چەند ڕۆژێك من سەفەری سلێمانیم کردو چومە ماڵی کاك سالار، شەو لەماڵەکەی ئەوان ماینەوەو ڕۆژی دواتر هەردووکمان بە ئۆتۆمبێل چووینە ماوەتو لەوێش بەپێ لەگەڵ کاك سالار چووینە شارستێن، مانگی سێی ساڵی1974 بوو، جەوێکی زۆر باراناوی بوو..لەشارستێن شەوێك ماینەوەو دوایی چووینە قەڵادزێ، لەوێ لەیەکتر جیابووینەوەو کاك سالار لە قەڵادزێ مایەوە. دواتر من لەگەڵ "سامی شۆڕش" یەکترمان گرتەوەو چووینە چۆمان..لە چۆمان ئەمانەتی پەروەردەی لێبوو..منیش کۆلێژم تەواو کردبوو،

بۆیە داواکاریەکم پێشکەش کردو، بووم بە مامۆستای زمانی کوردی لە دواناوەندی رواندزو لەناوەندی کچانیش دەرسم دەگوتەوە..لە رواندز مامۆستا جەمیل رەنجبەرم دۆزییەوە، ئەو ژوورێکی گرتبوو چوومە لای ئەو..ژوورەکەی لەماڵی پیاوێکی پەککەوتە گرتبوو ناوی "سەید برایم" بوو..خۆیو ژنەکەشی هەر پەککەوتەبوون..خۆیان لەخوارەوەی خانووەکە ئەژیانو ئێمەش لەسەرەوەی خانووەکە بووین..بەو شێوەیە تاوەکو بۆمبارانکردنی رواندز لەلایەن فرۆکەکانی حکومەتەوە لەوێ مابنەوەو دواتر چووینەوە چۆمان.

سەرەتا لەگەڵ کاک جەمیل ژوورێکمان گرتو دواتر ئەو خێزانەکەی هاتو ماڵی حۆیان دانا. بۆیە من بە تەنها مامەوەو دواتر دڵشاد عەبدوللاَ هاتە لامو بەیەکەوە بووین..من لە بەغدادەوە لەرێگەی حاجی برایمی برامو کاکە عەبەی کاریکاتێریستەوە دڵشادم دەناسی..کاتێکیش لە کۆلێژی کشتوکاڵ بوو، لەرێگەی شیعرەکانیەوە دەمناسیو ئاشنایەتیم لەگەڵیدا پەیدا کردبوو..ژوورەکەمان لەشوێنێکی لاچەپی چۆمان بوو..تاوەکو شۆرشیش توشی کارەسات بوو هەر لەوێ بووین..

کاتێك لەوێ بووین کۆمیتەیەك بە نهێنی بەناوی کۆمیتەی هەولێری کۆمەڵە لەناو شۆرش دروستکرا، کاك "جەمیل رەنجبەر" بەرپرسی ئەو کۆمیتەیە بوو، ستافی کۆمیتەکە

پێکهاتبوون لە"شەهید ئارام، دلێر تاهیری برازای کاک عومەر دەبابە، ئەنوەر شاکەلی شاعیرو منیش بووم" خاڵە شەهابی شێخ نوریش سەرپەرشتی دەکردین. بەو شێوەیە ئێمە کۆمیتەی نهێنی کۆمەڵە بووین لەنێو شۆڕشو لە چۆمان..من لەو کۆمیتەیەدا بەرپرسی دەشتی هەولێرو کۆیە بووم..لە کۆبوونەوەکاندا لەگەڵ کاک ئارام بەیەکەوە دەبووینو یەکترمان دەدیت..دلێر تاهیر لەگەڵ خاڵە شەهاب لە ئەمانەتی دارایی شۆڕش کاری دەکرد، بارەگاکەشیان لە دۆڵەکەی بەرامبەر گوندی دەربەندی رایات بوو.. لەسەر رێگاو دۆڵی دەربەندی رایەت دلێر ژوورێکی بچووکی گرتبوو، جارجارەش کۆبوونەوەکانمان لەوێ دەکردن.

بەو شێوەیە تا کارەساتو نسکۆی شۆڕش روویدا لە چۆمان ماینەوە، کە کارەسات روویدا ئێمە کۆبوونەوەیەکمان لەماڵی کاک ئارام کرد، ئەوکات کاک ئارام خێزانەکەی لەگەڵ بوو، ماڵیشی لە گوندی دەربەندی رایەت بوو، کۆبوونەوەکە بەسەرپەرشتی خاڵە شەهاب کراو کاک فەرێدون عەبدولقادریش لە کۆبوونەوەکە بوو. بڕیاردرا ئێمە بکشێینەوەو بچینە ناوچەی شاربازێرو لەوێ ئەگەر پێمانکرا مقاوەمەت بکەین..دواتر خاڵە شەهابو کاک ئارامو خێزانەکەیو کاک فەرێدون بە ئۆتۆمبیل رۆیشتن بۆ ئەو دیوی ئێرانو لەوێشەوە چوونەوە پێنجوێن..منو کاک جەمیل رەنجبەری رەحمەتیو

ئـەنوەر شـاکەلی‌و دڵشـاد عەبـدوڵڵاو سـەدیق رەنجبـەرو سـابیر گـۆران‌و حـاجی مـەمۆو چـەند کەسـێکی دیکـەشمان لەگـەڵ بوون..یـانزە دوانزەکـەس دەبووین..لـەرێگای دلێـر تـاهیرەوە وەرەقەیەکی تەزویرمان دروست کردو تێیدا نوسرابوو ئەمانـە سـەر بـە ئەمانـەتی داراییـن..لەگـەڵ خۆشمـان کۆمـەڵێك کەلاشـینکۆف‌و چـەند سـندوقێك فیشـەك‌و بـەتانی‌و پێویسـتیەکانمان هـەڵگرتن‌و بـەرەو مـاوەت دەسـتمان بـە پاشەکشە کرد..چەند سعاتێك دوای رۆیشتنمان فرۆکە قەسفی ئـەو ناوچـانەیان کرد..بـەو شـێوەیە بـەپێیان بـەرەو مـاوەت رۆیشـتین‌و دوای چـەند شـەوو رۆژێـك گەیشـتین..پاش شـەوێك مانـەوە لـەوێ..کاك جـەمیل‌و ئـەنوەر شـاکەلی‌و مـن دابـڕاین‌و هێزەکەی لەگەڵمان بـوو لـە مـاوەت تەسـلیمی رێکخسـتنەکانی کۆمەڵـەمان کـردن‌و ئێمـەش چـووینەوە پێنجـوێن لای خاڵـە شەهاب‌و هاوڕێیانی سەرکردایەتی کۆمەڵە لە گوندی "کێلو".

***ئەگەر ئەوسا کۆمەڵە خەڵکی لەگەڵ بوو، پێشمەرگەی هەبوو، بۆ مقاوەمتان نەکردو تەسلیم بە بڕیاری سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول بوون؟**

–راستی کە ئێمـە چـووینەوە پێنجـوێن‌و گونـدی "کێلـو".. لەوێ کۆبوونەوەیەکی سـەرکردایەتی کۆمەڵـە کـراو دوو شـەوو دوو رۆژی خایاند..پێشـمەرگەیەکی زۆری کۆمەڵـەش لـەوێ کۆبوونەوە.. بەپێی قسەی هاوڕێیانی سەرکردایەتی زۆر هـەوڵ

لەگەڵ سەرکردەو فەرماندەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان درا تاوەکو ئێمەش بۆ بەرگری لەگەڵیان بمێنینەوەو هاوکاریان بکەین..هەر لەوێش خاڵە شەهاب خۆیو کۆمەڵەی بە سەرکردەکانی پارتیو خەڵکەکە راگەیاند. لە پێنجوێن خاڵە شەهابو کاك فەرێدون سەردانی زۆر لە هێزەکانی پێشمەرگەیان کردو بارودۆخەکەیان بۆ باسکردنو داوای مقاوەمەتیان لێکردن..بەڵام کەس ئامادە نەبوو بەرگریی بکات.. لەلایەکی دیکەشەوە، خاڵە شەهاب هەر لەچۆمان چووبووە لای کاك"ئیدریس بارزانی" رەحمەتیو پێی گوتبوو: ئێمە رێکخستنێکی نهێنینو ئێستا خۆمان ئاشکرا دەکەین، چونکە ئەمرۆ رۆژی تەنگانەیەو ئامادەین لەژێر سەرپەرشتی ئێوە پێشمەرگایەتی بکەینو خۆمان لەپێناو کوردو کوردستانو شۆڕش بەکوشت بدەین..بەس تەنها ئێوە بڕیاری مقاوەمەت بدەنو شۆڕشەکە پەرتەوازە مەکەن..ئیدریس بارزانی رەحمەتی بە خاڵەشەهابی گوتبوو: وەڵلا مەجالی مقاوەمەت نەماوە.

***ئەی دواتر بۆ کۆمەڵە گەڕایەوە نێو شارەکان؟ بۆ هەر ئەوکات نەچوونە دیوی رۆژهەڵاتو لەوێ بمێننەوەو چارەنووستان وەکو ئەوانی تریێت؟ تۆش گەڕایەوە؟**

-دوای بێئومێدبوون لەوەی کەس ئامادە نییە بەرگریی بکات، سەرکردایەتی کۆمەڵە بڕیاری گەڕانەوەی بۆ نێو

شارەکانی کوردستاندا..خاڵە شەهاب بەپێشمان کەوتو بەپێیان لەرێگای ناڵپاریزو سەید سادقەوە گەڕاینەوە سلێمانی.. رێگاکەش هەموو مین رێژکراوو مەترسیداربوو..لە سەید سادق بەزیلی عەسکەری ئێمەیان بۆ یاریگای سلێمانی گواستەوەو لەوێ لەگەڵ کاک ئاوات عەبدولغەفور رێککەوتین و خۆمان درزییەوەو چووینە ماڵی ئاوات عەبدولغەفوور..بیرمە دایکی پێشوازی کردین..بەڵام چ پێشوازیەك..چونکە برایەکی کاك ئاوات لە بۆمبارانی زانکۆی قەلادزێ شەهید ببوو..زۆر ناخۆش بوو. بەڵام دایکی زۆر قارەمان بوو..هەرچەند دەگریا پێی گوتین من خەمی ئەوەم نییە کوڕەکەم شەهید بووە، بەڵام خەمی ئەوەمە ئێوە بەشکستخواردنەوە هاتوونەتەوە..خۆزگە بەسەرکەوتنەوە هاتبانەوە تا سەربەرز بام..

بارودۆخەکە دوای نسکۆو بێ ئەنجامبوونی هەوڵەکانی کۆمەڵە وای لێهات بگەڕێینەوە ناو میللەتی خۆمان.. بەهەرحاڵ من چەند شەوێك لەماڵی کاك ئاوات مامەوەو دواتر پەیوەندیم بە "تەجنید" کردو وەرقەیەکیان پێدامو منیان بۆ "ناسریە" گواستەوە..پێش ئەوەی بڕۆم سەرێکی خاڵە شەهابم دا..پێمگوت بزانم چی بکەمو چی نەکەم..پارەشم پێنەبوو.

گوتی: ئێمە تازە هاتووینەتەوەو ئەبێ ئاگات لەخۆت بێت، چونکە بچووکترین ئاشکرابوونت ..دەبێتە هۆی

لەسێدارەدانت.. گوتی دواتر کە هاتیەوە هەولێر سەرم لێبدەو پێت دەڵێم چۆن پەیوەندیم پێوە دەکەی..پێنج دیناریشی دامێ بۆ خەرجی خۆم..

بۆ بەیانیەکەی لەگەڵ سەدان کەس چووومە "تەجنیدی" سلێمانیو بە سەیارە ئێمەیان گواستەوە بەغدادو لەوێ لە سەربازگەیەك ماینەوەو دواتر بەشێك لە ئێمەیان بەرەو "ناسرییە" برد.. رۆژی دووەم هەموومانیان ریز کردینو گوتیان کێ دەرچووی کۆلێژو پەیمانگاکانە بێتەدەرەوە.. منو دوو کەسی دیکە لەریزەکە دەرچووینو ئێمەیان بۆ "ئینزباتی عەسکەری" بردین..من مانگێك لەوێ مامەوە..بەڵام راستی هەر دەترسام. دوای مانگێك سەربازی حکومەتی عێراق هەموو پێشمەرگەکانیان لەسەربازی دەرکردنو گەڕاینەوەماڵەوە.

***مام جەلال دەڵێت: من لە شۆڕشی ئەیلولدا پشتیوانیم لە بەرەی چەپ کردووە کە لەناو پارتیو شۆڕشدا هەبوون، لەوانە خاڵەشەهابو کاك نەوشیروانو برادەرانی دیکە..تۆ هیچ زانیارییەکت لەو بارەیەوە هەیە؟**....."دیداری تەمەن..ل.335.ب1"

—سەبارەت بەوەی مام جەلال لەشۆڕشی ئەیلولدا پشتیوانی تەیاری چەپی نێو شۆڕشی کردبێت، راستی من لە شۆڕشی ئەیلولدا مام جەلالم نەدیووە، بەڵام بەپێی ئەو زانیارییانەی خاڵە شەهابی شیخ نوری پێی دەگوتین، بەڵێ مام جەلال

پەیوەنـدی بــە خاڵــە شــەهابو کۆمــەڵێك کــادیری دیکــەی کۆمەڵەوە هەبووەو لـەنێو شـۆڕش پشـتیوانی لێـدەکردن، ئـەو کادیرانــەش بەشــی زۆریــان کۆنــە "جــەلالی" بــوون، بــەڵام ســەبارەت بــە کــاك نەوشــیروان ئەوکاتــە کــاك نەوشــیروان لــە ناوچـەی شۆڕشـی ئـەیلول نـەبوو، نـازانم لـەکوێ بـوو..وابزانم لەدەرەوەی وڵات بوو، پێموابێت لەگەڵ پارتی کێشەی هـەبوو، بەچـەند کـارێکی خـراپ تۆمـەتباریان کردبوو..لەراسـتیدا مـام جەلال لە شۆڕشی ئەیلولدا هـیچ دەسـەڵاتێکی نـەبوو، زۆریـش لەناو شۆڕش نەبوو.. زیاتر لەدەرەوەی وڵات دەبوو.

***ئایا مام جەلال یەکەمین سکرتێری کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بوو؟ چونکە لەدیداری تەمەندا دەڵـێ ساڵی 1973 من لەدەرەوە بووم، شیخ شەهابی شیخ نوریم بانگی دەرەوە کردو لـەوێ دەستم لەسـکرتێری کێشـایەوەو ئەرکەکـەم بـەو سپارد.؟...**"....دیداری تەمەن ..ل.15.ب2"

–من لەسـەر زاری برادەکـانم گـوێم لـێ بـووە، لەوانـە خاڵـە شیهابو کاك فەرێدون..دەیانگێرایەوەو دەیانگوت: کاتی خۆی سێ گروپی چەپ هەبوون، یەکێك لەو گروپانە مام جەلال بـوو، ئـەوەی تریـان کـاك نەوشـیروان بـوو، یـەکێکی تریشـیان خاڵـە شـەهابو کـاك فەرێـدونو ئـەوانی دیکـە بـوون، دیـارە جگـە لەوانەش کەسانی دیکەش هەبوون.

ئەو گروپانــە، دوای چــەندین کۆبوونــەوەو دانیشــتن دواجــار رێکدەکەون لەسەر ئەوەی هەموویان یەکبگرنەوەو رێکخراوێکی چــەپی مارکســی-لینینــی لێدروســت بکــەن. بــەپێی ئــەو زانیارییانــەی منــیش لــەبرادەران بیســتومەو گــوێم لێــی بــووە، راستە یەکەمین سکرتێری کۆمەڵە "مام جەلال" بووە.

بــەڵێ، دوای ئــەوەی مــام جــەلال بیرۆکــەی دروســتکردن رێکخراوێکی نیشتیمانی هەمەلایەنەی وەك "یەکیتی نیشتیمانی کوردســتانی" لا گەلاڵــەبوو، دەســتبەرداری ســکرتێری کۆمەڵــە بــوو، ئەرکەکەشــی بــە خاڵــە شــیهابی شــیخ نــووری ســپارد، ئەمەشی بۆ ئەوە بوو دواتر کۆمەڵە ببێتــە یــەکێك لــە باڵــەکانی نێو" یەکێتی".

***کاتێك لەدیوانیە سەرباز بوویت رۆژێك ئەفسەری سیاسـی قسـەی نەشـیاو بـە شۆڕشـی کـوردو بـە بـارزانی رەحمـەتی دەڵێت‌و تۆش وەڵامی دەدەیتەوە، رووداوەکە چۆن بوو؟ خـۆ تۆ ئەو کات گەنجێکی خوێنگەرم‌و توندڕەوی کۆمەڵە بوویـت، چۆن بوو داکۆکیت لە بارازانی نەمر کرد؟**

-ئەمە راستە، لە کۆتایی 1973 بوو، لەسەربازگەی مەشــقی دیوانیە بووین، نزیکەی سێ سەد کەس لەدەرچوانی پەیمانگاو زانکۆکانیــان خســتبووینە خــولی ئەفســەرانی یــەدەگو بــەو نیــازەبوون هەنــدێکمان بکــەن بــە ئەفســەر، مەشــقێکی زۆر قورســیان پێــدەکردین. لــەو ســالانە بــوو کــە خۆپیشــاندانێکی

گەورە لە شەنگال روویدا بوو، خەڵکەکە قایمقامی شەنگالیان کوشتبوو. دواتر حکومەتی عێراقی هێزێکی زۆری رەوانەی شەنگال کردبوو، خەڵکێکی زۆری ئێزیدیو ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستانیان گرتن. لەدوای ئەو رووداوەی کوشتنی قایمقام، ئەفسەری رێنمایی سیاسی کەوا مولازمێکی پلە دووی بوو کۆبوونەوەیەکی بە ئێمە کرد، ئەفسەرەکە ناوی "ملازم سەباح"بوو، پیاوێکی هێمنو لەسەر خۆ بوو، لەقسەکانیدا باسی رووداوی خۆپیشاندانی شەنگالو کوشتنی قایمقامو تۆقاندنو ئاژاوەکەی کرد..دواتر قسەی بە پارتیو شۆڕشی کوردو بارزانی رەحمەتی گوت..

راستە، من ئەو کات کۆمەڵەیەکی توندڕەوو خوێن گەرمو سەرسەخت بووم..نەپارتی بوومو نە کەیفیشم بە پارتی دەهات!..بەڵام کاتێك ئەو ئەفسەرە عەرەبە قسەی لەسەر کوردو بارزانی کرد، من وەك کوردێك هەستم جولاو خۆم پێنەگیرا..هەستامەوەو قسەمکردو گوتم:

–پێم سەیرە تۆ باسی حزبێك دەکەی کە هاوپەیمانە لەگەڵتانو باسی بارزانی دەکەی کە سەرۆکی ئەو حزبەیەو هاوپەیمانیتان لەنێواندا هەیەو لەیەك بەرەدان..هەق نییە بەو شێوەیە باسی ئەو حزبەو سەرۆکەکەی بکەیت.. ئەوان کوردنو ئێمەش کوردین..

برادەرەکانی دیکە لەدواوە رایاندەکیشام و دەیانویست دامنیشێننەوە، هەڵوێستەکەمیان پێ خراپ بوو..بەهەرحاڵ هەندێ قسەم کرد..بەڵام ئەفسەرەکە وردە وردە هاتەپێشەوەو لێم نزیك بوەوەو گوتی: "کوڕی خۆم تۆ عەسکەری". دواتر برادەران گوتیان کارێکی خراپتکرد.. دوای تەواوبوونی کۆبوونەوەکە بە چەند کاتژمێرێك مراسیلی ئەفسەرەکە هات و گوتی ملازم سەباح تۆی دەوێت!..بەڕاستی کە وای گوت ترسام..بەهەرحاڵ کە چوومە لای..سڵاوێکی سەربازیم بۆ کرد..

یەکسەر گوتی: کوڕم تۆ عەسکەری، زانکۆت تەواو کردووە، یاسایەك لەعێراق هەیە ئەوەی سەر بە حزبی بەعس نەبێت و لەناو عەسکەر بێت لەسێدارە دەدرێت..تۆ ئەو قسانە بۆ دەکەی؟ لەجێگەی دیکە ئەو قسانە مەکە. زۆر ئامۆژگاری کردم..بەراستی کە هاتمەوە ئەو جا ترسم لێ نیشت..زانیم شتێکی خراپم کردووە، بەڵام ویژدانم قبوڵی نەکرد قسە بە بارزانی رەحمەتی و شۆڕشی کورد بڵێت و قسەکانی خۆم کردن.

## سەرەتای پەیوەندیکردن بە شۆڕشی نوێ

***چۆن بوو پەیوەندیت بەشۆڕشەوە کرد، لەکاتێکدا دوای ئازاد بوونت لە زیندان خەریکی ژنهێنانو خێزان پێکەوەنان بووی؟ بڕیارێکی قورس نەبوو دەستگیرانەکەت جێبهێڵیتو ببی بە پێشمەرگە؟**

-بێگومان بڕیارەکە قورس بوو، بەڵام بڕیاری پەیوەندیکردنم بە شۆڕش دابوو، تەنها سێ مانگ بوو ژنم مارەکردبوو، بەڵام نەمگواستبووەوە دوای ئەوە چومە شاخ.. لەمانگی 3ی ساڵی 1980 "پەخشان خان" لەسلێمانیەوە لەگەڵ "پاکیزە خان"ی خێزانی کاك فەرێدون هاتنە ناوزەنگ.. ئەو کاتەی پەخشان خان هاتبوو من لە سەردەشت بوومو دەگەڕامەوە، لەرێگای مامۆستا "محسن عەلی ئەکبەر" کە ئەوسا بەرپرسی یەکێتی بوو لە سەردەشت، پێی گوتم نامەیەك هاتووەو دەڵێ پەخشان هاتووەو چاوەڕێت دەکات. پێشتر من نامەیەکم لەرێگەی کاك فەرێدونەوە بۆی ناردبوو..چونکە کاك فەرێدون پێی گوتبووم کەوا "پاکیزە"ی خێزانی دێتەی لایو منیش گوتم پێمخۆشە پەخشانیش لەگەڵ

خۆی بێنێت..کاتێک گەیشتمەوە ناوزەنگ وتیان پەخشان لەماڵی کاک دارۆی شێخ نورییە، چونکە ئەوکاتە نەرمین خانیش هاتبوو..قاتێکی پاک و تەمیزم لەبەرکردبوو..قوماشەکەی پێیان دەگوت ئەفسەری و جوان خۆم هەڵخستبوو..چوومە ئەوێ و شەویش هاتینەوە ئەو ژوورەی بۆمان رێکخرابوو، چ ژوورێك لەبەر تاریکی تاماوەیەك چاوت رووناك نەئەبوونەوە، دەبا ئاگاشت لێبێت خۆت بە ئەستوندەکەیەدا نەدەی کە لەناوەڕاستی ژوورەکە بوو، بەڵام ژن گواستنەوەی چی. بۆ ئەوەی شوێنێك رێك بخەین، ژوورێکی بچووکی زیندان هەبوو هەستاین ژوورەکەمان پاککردەوەو کردمان بەژووری بوك و زاوا..لەتەنیشت ئەو ژوورەی منیش ..ژوورێکی هەندێك لەهی ئێمە گەورەتری دیکە هەبوو ئەوێش پاککرایەوەو بوو بە ماڵی کاک فەرەیدون عەبدولقادرو پاکیزەخان. لەنێوان هەردوو ژوورەکەشمان ژوورێکی گەورەتر هەبوو پێنج مەتر بەچوار مەتر یان زیاتر دەبوو بە کۆڵەگەو شتی وا راگیرابوو. خۆی شوێنی خولی کادیران بوو.. ئیتر ماڵ و حاڵمان بەوشێوەیە دەست پێکرد..ئەو کاتەی من لەزیندان بووم، پەخشان چوار ساڵان چاوەڕێی کردبووم، ساڵێکیش لەسەربازی بووم، ئەو هەر چاوەڕێ بوو..دواتریش چەند مانگێك و دوای بوونم بە پێشمەرگە..هاتە شاخ. ئیتر کە ئەوان هاتن لەوێ ژنم گواستەوە..

***تۆ کە لە سەرکردایەتی بوویت هیچ جار ئەرکی چوونەخوارەوەو گەڕان بەلادێکان و بارەگاکانی پێشمەرگەیان پێ سپاردی؟ بیرتان ماوە یەکەم ئەرکتان چیبوو؟**

-یەکەمجار وەك جەولە لەگەڵ کاك مەلابەختیار چووینە دۆڵی خۆشناوەتی و دەشتی هەولێرو وراتی کۆیە، ئەوسا من هیچ پلەیەکی دیاری حزبیم وەرنەگرتبوو، بەرپرسیارێتیم نەبوو. هەر لەخۆمەوە ناوم لەخۆم ناو گوتم من وەك بەپرسی کۆمەڵە دەچمە ئەو جەولەیە..بەرپرسی چی خۆ نە شانەی رێکخستن هەبوو، نەهیچ شتێك. بەڵام چونکە ئەو کات بڕوامان بەهێزو پتەوبوو، پێمانوابوو ئەبێ بچینە خوارەوەو ناو گوندو ناوچەکان و خزمەت بکەین.

لەمانگی 6 ساڵی 1980دوای نیوەڕۆیەك بەرەو رۆژئاواو لەگەڵ کاك مەلا بەختیارو دووسەد پێشمەرگە لەناوزەنگەوە بەرەو دۆڵی خۆشناوەتی کەوتینەرێ..جەولەکە مانگێك و بیست رۆژی خایاند.. لەو ماوەیەدا چەندین شەڕ لەگەڵ هێزەکانی "سلێمان بیرێژی"روویاندا، ئەو کات "سلێمان بیرێژی" بەرپرسێکی قیادە مۆقەتە بوو.

دوای ئەو رووداوانە، هێزی ترمان بۆهات..هێزێك لەناوچەی گەرمیان بە لیپرسراوێتی کاك سامان گەرمیانی و ئەوەی تریان لە هەورمان بەلێپرسراوێتی کاك محەمەدی حاجی مەحمود،

کاکە حەمە ئێستا سکرتێری حزبی سۆسیال دیموکراتی کوردستانە..ئەو هێزانە لە ناوچەی خۆشناوەتی کۆبوونەوەو دواتر بوون بەدوو بەشەوە. هێزێك بەسەر پەرشتی کاك محەمەدی حاجی مەحمود لە خۆشناوەتی مایەوەو هێزەکەی دیکەش بەسەر پەرشتی کاك مەلابەختیارو کاك سامان گەرمیانی بەرێکەوتین بۆ جەولەو چوینە وراتی کۆیە.. دوای تەواو بوونی جەولەکەمان گەراینەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ هیزەکەی دیکەدا یەکبگرینەوە.

***دوایی بۆ گەڕایتەوە سەرکردایەتی‌و درێژەت بەمانەوە وەك پێشمەرگەیەك نەدا؟ هیچ هۆکارێك هەبوو بگەڕێیەوە؟**

–هەر لەهەمان ئەو جەولەیەی باسمکرد، گەیشتینە گوندی سماقوڵی گرتك لەوێ نامەیەکی کاك نەوشیروان کە بۆ کاك مەلا بەختیاری ناردبوو گەیشت.. لەو نامەیەدا داوای گەڕانەوەی منیان بۆ سەرکردایەتی کردبوو، تێیدا نوسرابوو کە پێویستیان بە "ئەرسەلان" هەیەو دەبێ بگەڕێمەوە..کاك مەلابەختیار هەواڵەکەی پێ گوتم..بەڵام من ئەو هەواڵەم پێخۆش نەبوو، چونکە ئەو کات باو باوی جەولەو کاری پێشمەرگانە بوو، گەڕان لە ناوچەکانی کوردستان کارێکی گرنگ بوو، دەبوو بەناو گوندەکاندا بگەڕێین‌و خەڵك ببینین. شتێکی تریش هەبوو ئەو پێشمەرگانەی چالاك بوون‌و هەمیشە لە جەولەدابوون، بەو

پێشمەرگانەیان دەگوت کە لەسەرکردایەتی ئەمانەوە "مریشکی مەصلەحە"..وا باسیان دەکردنو دەیانگوت ئەوانە بەهیچ شێوەیەك ناجولێن. بۆیە بە کاك مەلا بەختیارم گوت نامەوێ بچمەوەو برادەرەکانم بە تەنها بەجێبهێلم..بەلام کاك بەختیار گوتی ئەمە نابێت چونکە ئەوە ئەمری کاك نەوشیروانەو دەبێ جێبەجێ بکرێ..ئەو کاتە مام جەلالیش لەکوردستان نەبوو، کاك نەوشیروان بەرپرسی یەکێتیو کۆمەڵەو هێزی پێشمەرگەو شۆڕش بوو. بەهەرحاڵ کاك مەلابەختیار قەناعەتی پێکردم کە دەبێ بچمەوە. گوتیشی تۆ تازە ژنت هێناوەو بەڵکو لەوێ کارێکیان بۆ دۆزیبیتەوە.

بەوشێوەیە لەگەڵ کاك مەلابەختیار چوینە گوندی جەلیو شەوێك لەوێ ماینەوەو ئێوارەی رۆژی دواتر بەرەو داری قەمتەرانو بناری شاخی کۆسرەت بەرێ کەوتین. ئەو شەوە تا بەیانی هەر بەرێگاوە بووین، بەراستی زۆر هیلاك بووم..لەسەر کانیاوێکی بناری شاخی کۆسرەت کەوا بەیانیەکەی گەیشتبووینە ئەوێ تا ئێوارە پشووماندا، ئێوارەکەی هەمان رۆژ دەستمان بەرۆیشتن کردەوەو دەبوایە بچینە کانی وەتمان. کاتێك لە گوندی کانی وەتمان چاومان بەکارەباو بریسکانەوەی گلۆپەکانکردو بینیمان سەلاجەیان هەیە زۆرمان پێ خۆش بوو.

لەوێوە چووینەوە هەیبەت سولتانو بەکەڵەکی بچووک لە ناوی کلێسە پەرینەوەو بەرەو سورقاوشان چووین. لە سورقاوشان لای کاک عەلی بچکۆڵو لەسەر چەمەکە رۆژێکماینەوەو پشوێکی چاکماندا. دواتر بەرێگای ناوچەی تەلانو شێخ باخدا چوینەوە ناوچەی سەرگەڵوو بەرگەڵو..بەو شێوەیە گەیشتینەوە سەرکردایەتی.

***کاتێك گەیشتیەوە سەرکردایەتی، چی روویدابوو، بۆچی کاك نەوشیروان داوای کردبووی؟**

–بەڵی.. کە گەیشتینەوە دوای رۆژێك پشوودان کاك نەوشیروان هاتەماڵەوەمان کە لەژێر خێمەیەك بووین لە توژەڵە..کاك مەلابەختیارو روناك خانی خێزانیشی لەنزیك ئێمەوە لە خێمەیەکی دیکەدا بوون. کاك نەوشیروان سەریداینو دوای بەخێرهاتنەوەو ماندوونەبوونی.. گوتی من ئیشێکم بە تۆیەو کارێکم بۆدۆزیویتەوە. منیش گوتم ئیشەکە چییە؟ گوتی بەگەڕخستنەوەی رادیۆی شۆڕشەو من تۆم بۆ ئەو کارە هەڵبژاردوەو هەموو پشتیوانیەکیشت دەکەم. منیش هەمان ئەو قسانەی بە مەلا بەختیارم گوتبوون، بە کاك نەوشیروانیشم گوتنەوەو گوتم من حەزم لە پێشمەرگایەتیەو بەڵێنم بە هاورێ پێشمەرگەکانم داوەو دەمەوێ لەگەڵیان بمێنمەوەو بەجێیان نەهێڵم. گوتیشم من بەهۆی چوارساڵ

زیندانییەوە ماوەیەکە لەنوسین و خوێندنەوە دابڕوام و لەزیندان هیچ بوارێك بۆ نووسین و خوێندنەوە نەبووەو نوسینیش پێویستی بەخوێندنەوە هەیەو لەوانەیە ئێستا من دەرقەتی رادیۆی شۆڕش نەیەم. بەڵام ئەو هەر گوتی پشتیوانی تەواوت دەکەم. بەهەرحاڵ دوایی قەناعەتی پێکردم و خۆشم قەناعەتم بەقسەکانی هەبوو، بەکارەکە رازی بووم.

***چۆن چەکت دەستکەوت، خۆت ئەزانی ئەوکات دەستکەوتنی چەك کارێکی ئاسان نەبوو؟**

–هەر لەدەورەی کادیران بووم..دوای سێ مانگ رۆژێك مام جەلال بەدوایدا ناردم و گوتی وەرە نامەیەکت دەدەمێ و بچۆ بۆ ئێران لای کاك "سەلاحەددینی موهتەدی" لە بۆکان بۆ خۆت چەکێك بێنە.

کاك سەلاحەدینی موهتەدی لە بنەماڵەیەکی شۆڕشگێرو دەوڵەمەندی بۆکان بوو، کاك عەبدوڵڵای براشی سکرتێری کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران بوو..کاك سەلاح پیاوێکی شارەزاو خوێندەوارێکی بێوێنەو بەرێز بوو.. نامەکەم بۆ بردو دووشەوو دوو رۆژ لەوێ مامەوە..چەندین پێشمەرگەی تریشی لێ بوون.. ماڵەکەی وەکو هوتێلی لێهاتبوو.. رۆژانە خزمەتی خەڵکیان دەکرد.. لەوێ کەلاشنکۆفێکی "صینی"ی و مەخزەنێکیان پێدام و بووم بەخاوەنی چەکی خۆم..جا

نوکتەکـە لێـرەوە دەسـت پێـدەکات..من لـەوێوە هاتمـەوە سەردەشتو هەواڵی هاتنی پەخشانیان دامێ. ڕێگـاو بانـەکان زۆر سەخت بوون..هەرچۆنێك بێت لەگەڵ کاك "حامدی حـاجی غالی"و چەند پێشمەرگەیەکی تر ڕێك کەوتینو بەجێبێك بـەرەو بێوران بەرێکەوتین.. لەرێگادا جێبەکە هەر دەچەخیو دەبوایە پاڵیبـدەینو بـەپێ بـڕۆین.. لـەو بگـرەو بەردەیـەدا مـن "مەخزەنی" کەلاشینکۆفەکەم لێ ونبوو..ئیتر بەدرێـژایی ڕێگـا تـا هاتینـەوە نـاوزەنگ کـاك "حامـد" سـەری خستەسـەرمو دەیگوت..هەی هەی ئەفەندی هاتووە ببێتە پێشمەرگە..کەچی مەخزەنی کەلاشـینکۆفەکەی ونکـردووە..وەڵا پێشـمەرگەیەکی باشـی لـێ دەردەچـێت..هەر پـەلاری لێـدەدام. ئـەوان پێشـمەرگەی کـۆن بـوونو منـیش کابرایـەکی ئەفەنـدیو لـە بنەماڵەیەکی محافیزکـار هاتبووم..قـەت ئـەو سـەراوو دەراوەم نەبینیبوو.. بەهەرحاڵ تا چووینەوە ناو زەنگ خۆم بـێ دەنـگ کرد.

***چوویتە سەرکردایەتیو لەوێ گیرسایەوە، ئایا پێشتر کەست دەناسی؟**

*بـەڵێ، یەکـەمجار چـومە بارەگـای کـاك نەوشـیروان.. بەگـەرمی پێشـوازی لێکـردمو نامەکـەم پێیـدا.. پێشـتر کـاك نەوشیروانم نەبینی بوو، بەلام لەرێگای گۆڤاری "رزگاری"یەوە

ناوم بیستبوو.. ماوەی مانگێك لەلای كاك نەوشیروان مامەوەو لەگەڵ كاك نەوشیروانو كاك حەمە تۆفیق لەیەك ژوور دەخەوتین. زۆر ڕێزی گرتمو سوپاسی ئەكەمو هەزار ڕەحمەت لەگۆڕی بێت.. ڕێگای نەدەدا دەست لە ئاویش بنێمو وەكو خۆیو كاك حەمە تۆفیق مامەڵەی لەگەڵدا دەكردم..

ئەوەی لای من سەیر بوو.. كاك نەوشیروان مەشروب خۆرو جگەرە كێشێكی بێ وێنە بوو.. شەو نیوەی شەو كە خەبەرم دەبووەوە، دەمبینی كاك نەوشیروان لە بن بەتانیەكەیەوە سەری خۆی دەرهێنا بوو.. بتڵی ویسكیەكەی لای سەری خۆی داناوەو ناوە ناوە قومێكی خەستی بەبێ ئاوو بێ هەموو شتێك لە بتڵەكە دەداو بەسەریشیەوە جگەرەی دەكێشا..

ئەوسا خانووەكان وشكە كەڵەك بوون..دوای مانگەكە دەورەی كادیران كرایەوەو من بووم بە مامۆستاو دەرسی مێژووی كوردم لەدەورەكە دەگوتەوە..ئەو كات كۆمەڵێك كادیری چاك لەدەورەكە بوون "هێرۆخان"یش لەوێ وەك خوێندكار بەشدار بوو..جگە لەو "نازەنین خانی خێزكانی كاك ئەحمەد بامەڕنیش كە خوشكی نەرمین خان بوو" لەوێ بوو، لەگەڵ "بەیان" ناوێك كەوا لەزانكۆی موصڵ خوێندكاری كۆلێژی پزیشكی بوو، دوای ئاشكرابوونیان هاتبوونە شاخ.. پێشڕەو ناوێكیش خەڵكی چەمچەماڵ بوو، لەدەورەكەدا

دەرسی ئابووری ئەگوتەوە. هەتا بلێی لێهاتوو بوو، بەلام بەداخەوە دواتر شەهید بوو.

***بیرت ماوە ئەو کات کێ سەرپەرشتی خولی کادیرانی ئەکرد؟**

–ئەو کات کاک فەرەیدون عەبدولقادر بەڕێوەبەری دەورەی کادیران بوو، ئەوەی من باسی ئەکەم مانگی سێی ساڵی 1980یەو دەورەکەی ئەو ساڵە تا مانگی پێنجی خایاند.. ئەو شوێنەی کردبوومانە ماڵی خۆشمان لە بنەڕەتدا شوێنی زیندان بوو، دواتر پاککرایەوەو کەلوپەلی بۆکرپدراو بوو بە شوێنی دەوەری کادیران، ئەو کادیرانەی دەهاتنە دەورەکانەوە ..هەم لەوێ ئەخەوتن، هەمیش دەرسیان تێدا وەردەگرت.

## کێشەکانی نێوان کاك نەوشیروان و دەزگای راگەیاندن

***خۆت ئەزانی رادیۆ بەشێکی گرنگی دەزگای راگەیاندنی یەکێتی بوو، تۆش بەرێوەبەری بووی پەیوەندیتان لەگەڵ بەرپرسی ئەو کاتی مەکتەبی راگەیاندن کە "مامۆستا جەعفەر" بوو چۆن بوو؟**

–دیارە کە من لەلایەن کاك نەوشیروانەوە لەرادیۆ دانرابووم، پەیوەندی کاك نەوشیروان لەگەڵ "مامۆستا جەعفەر" باش نەبوو. مامۆستا جەعفەر هەم ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو، هەمیش بەرپرسی دەزگای راگەیاندنی شۆرش، بەرادیۆشەوە بوو. من ئەوەندەی پرس و رام لەگەڵ مام جەلال و کاك نەوشیروان دەکردو راسپاردەی ئەوانم جێبەجی دەکرد، لەراستیدا ئەوەندە پرس و رام بە ماموستا جەعفەر نەدەکردو پەیوەندیشم لەگەڵیدا باش نەبوو!.

ئەوساش بارودۆخی یەکێتی تەکەتولاتی تێکەوتبوون یەکێتی هەر خۆی لەسەرەتاوە وا دروست ببوو. منیش تەکەتەولی مام جەلال و کاك نەوشیروان بوومو لەگەڵ تەکەتولی کاك مەلابەختیارو کاك سالارو مامۆستا جەعفەر نەبووم.. چونکە ئەوان هەر لەسەرەتاوە پێیان خۆش نەبوو ئێمە کە "گروپی زیندان" بووین بچینە ئەوێو بەیاننامەیان لەسەر

برادەرانــی زینــدان نووســیو ململانــێ لەنێوانمانــدا دروســت بووبــوو. کاتێـك ئێمـە پەیوەنـدیمان بەشۆڕشـەوە کـرد ئـەوان ناکۆکیەکانیان لەگەڵماندا نەشـاردەوەو پێیـان نـاخۆش بـوو.. بۆیــە ئێمــە بەشـێوەیەکی ئاســایی کەوتینــە لایــەنو بــەرەی مامجەلالو کاك نەوشیروان..جگە لەو هەڵوێستەی ئێمەش کـاك نەوشــیروان خۆیشــی نــاکۆکی تونــدی لەگەڵــدا ئــەو گروپــەدا هەبوون.

***ئایا کـاك نەوشـیروان لـەژێر گوشـارو هەڕەشـەدا وای لـە مامۆسـتا جەعفـەر"فازڵ کـەریم" کـرد دەزگـای راگەیانـدن بەجێبێلێت، یان هەر خۆی وازی هێنا؟**

–ئەو باڵـەی ناویـان لـەخۆیان نـابوو کۆمیتـەی هەرێمـەکان "کاك مـەلا بـەختیارو کـاك سـالارو مامۆسـتا جەعفـەر"، جگـە لــەوەی ناکۆکیــەکانیان هــەر بــەردەوام بــوون لەگــەڵ کــاك نەوشیروان، دژی سەرکردایەتی کـۆنی کۆمەڵـەش بوون..بـەڵام مام جـەلال هـەر هاوسـەنگی راگرتبـوو.. زیـاتریش بـەلای کـاك نەوشــیرواندا دەشــکایەوە..کاتێك کــاك نەوشــیروان منــی لەراگەیانـدنو لـەرادیۆ دانا..لەراسـتیدا مـن بەشـێك بـووم لـەو نــاکۆکیو ململانێیانــەی هەبوون..چــونکە مــن هاوکــاری مــام جــەلالو کــاك نەوشــیروان بــوومو مامەڵــەو هەڵسوکەوتیشــم لەگەڵیاندا لەوانی دیکە پێ باشـترو خۆشـتر بـوو.. دۆسـتایەتی

زۆریشم لەگەڵ مەلا بەختیار هەبوو. لەئەنجامی ئەو ناکۆکیانە بوو مامۆستا جەعفەر سەری خۆی هەڵگرتو چووە هەندەران..بەڵام ئەوەی هەڕەشەی لێکرابێت ئاگادار نەبوومو من نازانم.

***دوای ساڵێك بە بڕیاری سەرکردایەتی بووی بە بەرپرسی دەزگای راگەیاندنی یەکێتی، ئەمە چۆن بوو؟**

-من لە مانگی 12ی ساڵی 1979 بوومە پێشمەرگەو لەمانگی 9ی ساڵی 1980و بۆ ماوەی ساڵێك بەرپرسی رادیۆکە بووم، پەیوەندییەکی ئەوتۆم لەگەڵ بەرپرسی دەزگای راگەیاندن، مامۆستا جەعفەر نەبوو.. ناکۆکیەکانی کاك نەوشیروانیش لەگەڵ مامۆستاو برادەرەکانی دیکەی زیاتر بوون.. بۆیە مامۆستا جەعفەر سەری خۆی هەڵگرتو چوو بۆ ئەوروپاو وازی لەدەزگای راگەیاندن هێنا.. کاتێك مامۆستا جەعفەر چووە ئەوروپا.. بەشێوەیەکی ئاسایی لەپاییزی ساڵی 1981 من بووم بە بەرپرسی دەزگای راگەیاندنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان..ئەو کات بارەگای دەزگای راگەیاندن لە گوندی توژەڵەو لەودیو، لەرۆژهەڵاتی کوردستان بوو.

***باشە خۆ ئەندامی تری دەزگای راگەیاندن لەوێ هەبوون، بۆ تۆ بوویتە بەرپرسی دەزگای راگەیاندنو ئەوانی تر نەبوو؟**

**ئەوانەی دیکە کێ بوون کە لەوێ کاریان ئەکرد؟ ئەو بەرپرسیارێتیە نوێیەت کێشەی بۆ لەگەڵ ماموستا جەعفەرو هاورێیانی ترت دروست نەکرد؟**

-راستە.. کە من بوومە بەرپرسی دەزگای راگەیاندن کۆمەڵێك کەسی دیکەشی لێبوون، لەوانە "هوشیار عابد" خەڵکی دهۆك بوو، لەم دواییانەشدا بووە ئەندامی جڤاتی نیشتمانی بزوتنەوەی گۆڕان و بەرپرسی مەکوی دهۆکی بزوتنەوەکە. هەروەها "ئەردەلان و کاروان"ی لێبوون کە برای شەهید بەختیار بوون. سەعدون فەیلی و خەسرەوی خالۆزای کاك سەعدونیش لەوێ بوون..خالۆزاکەی دواتر بەنهێنی بەسەردانێك چووەوە بەغدادو بەداخەوە لەوێ شەهید بوو. کاك فرید ئەسەسەردو ئازاد چالاك و هەڤاڵ کوێستانی و ئەبوبەکر خۆشناویش لەوێ بوون و پاش ماوەیەکیش مامۆستا حەمەی حەمە باقی لەڕووی رۆشنبیری هاوکاری دەکردین و لامان بوو، هەروەها ماوەیەك "نالە-ناسر حەفید" کەوا کوڕی شێخ کەریمی قادرکەرم بوو هاتە لامان...بورهان قانعی رەحمەتیش هاوکاری دەکردین. ژمارەیەك خەڵکی تریش لەوێ بوون ئێستا ناوەکانیانم لەبیر نەماون لەوانەیە لەبەر هەڵکشانی تەمەن بێت..یان بەهۆی ئەوەوە بێت کە مەسەلەکە چل ساڵی بەسەردا تێپەڕیووە..بەڵام من بە بڕیاری سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی کرام بە بەرپرسی دەزگای راگەیاندن.

# بەرپرسیارێتی دەزگای راگەیاندنو
# رۆڵی رادیۆی گەلی کوردستان

***یەکێك لە هێزە مەعنەوییەکانی شۆڕش رادیۆکەی بوو کە داینەمۆی شۆڕش بوو، چۆن داتان مەزراندو بەگەڕتان خستەوە؟**

-ئەو کاتەی کە من چووم رادیۆکە یەکی کەوتبوو، هیچ شتێکی نەبوو. سەرەتا خێمەیەکمان لەنزیك گوندی توژەڵەو لەنزیك ماڵی "حاجی رەسوڵ" هەڵدا.. شوێنەکە توزێك لەدووری گوندەکەوە بوو..خێمەکە هەم شوێنی پێشمەرگەو هەمیش ستۆدیۆ بوو! جیهازەکانی ئەو کاتیش دوو ریکۆردەر"تەسجیل"ی بچووکی 17 دیناری ئەو سەردەم بوو، یەکیان بۆ تۆمارکردنو ئەویتریشیان بۆ لێدانی گۆرانیو مۆسیقاو شتی لەو بابەتە بەکار دەهێنران.

لەکاتی تۆمارکردنی بەرنامەکانیش دەبوایە چەند پێشمەرگەیەك لەدووری پەنجا مەترێك بوەستن بۆ ئەوەی هەم خەڵکی گوندو هەمیش کادیرو پێشمەرگەی دیکە نزیك

نەبنەوەو یانیش ماڵیاتی گوندەکە لەوێ نزیك نەبنو دەنگیان لەتۆماری بەرنامەکان لەگەڵ دەنگی بێژەرەکە دەرنەچێت.. ئەگەرچی جاری وا هەبوو دەنگی ماڵیاتەکانی گوندو هاواری خەڵکی هەر دەردەچوون. سەرەتا بە سادەییو کولەمەرگی دەستمان بەتۆمارکردنی بەرنامەکانمان کردەوەو کارەکەمان خستەوەسەر سکەی خۆی.

دواتر بۆ زستانەکەی دوو ژوورمان دروستکردن، یەکیان بۆ پێشمەرگەو ئەویتریان بۆ رادیۆو ژورێکی بچوکیش بۆ مەتبەخو ژوورێکیش بۆ من.. ژوورێکی تریشمان بۆ ئەو دووکچە دروستکرد کە لامان بوون. ئەوانیش "پەیمانو نەرمین" بوون، پەیمان خوشکی شیخ لەتیفو شێخ عەتای باراوی بوو، بەلام نەرمین نازانم کێ بوو!. بەو شێوەیە ستۆدیۆی رادیۆکەمان بردە ناو خانووەکە..

## *بارەگای ئەو کاتی رادیۆکە لەکوێ بوو؟ لەڕووی پارێزگاری لێکردنیەوە حسابی شوێنەکەی کرابوو؟

–بارەگای رادیۆ ئەو کات لە توژەڵە بوو، بێگومان، شوێنی رادیۆکە لەسەر قوتە شاخێك بوو، چونکە ئەوسا رادیۆ بە شەپۆلی دەنگی کاری دەکردو دەبوایە پێشەکەی کراوەبێتو تا دوو سێ کیلۆمەتر بەربەستی لەبەردەم نەبێت..بۆ ئەوەی وردە وردە شەپۆلەکان بەرەو ئاسمان بەرزببنەوەو

بگوازرێنـــەوە.. لەلایـــەکی دیکەشـــەوە شـــوێنەکە لـــەدیوی کوردســـتانی ئێـــران بـــوو، بـــۆ ئـــەوەی تۆپبـــارانو بۆمبـــارانی فرۆکـــەکانی ســـوپای عێـــراق نەیگرێتـــەوە، بـــەهۆی ســـەختی شوێنەکەشەوە رادیۆکە پـارێزراو بـوو. پێموایـە ئـەو ماوەیـەی ئێمـە لـەو ناوچـەیە بـووین تـەنها جارێـك فرۆکـە بۆمبـارانی ناوچەکەی کردبوو..

*یەکەم ستافی ئەم رادیۆیە گەر بیرت مابێت کێبوون؟

–سەرەتا ئـەو سـتافەی لـە رادیۆکـە بـوون لەوانە "پشـکۆی سەعید ناکام" کە وەك نووسەرو بێژەر کاری دەکرو دەنگێکـی زولاڵـی هـەبوو، نوسـینی تـەنزئامێزو "کـالا بەقـەد بـالا"ی دەنوسیو رۆڵی باشی هەبوو. هەروەها "بورهـان قـانع" لـەوێ بوو. ئەنـدازیارانی ئێزگـەش "کـاك رێبـواری موهەنـدیسو کـاك رەنجەی موهەنـدیس" بـوون، ئەوانـە خـەڵکی کـەرکوك بـوون. کاتێك لەشوێنی زسـتانەشمان جـێگیر بـووین کۆمـەڵێك کەسـی دیکـەمان بـۆ هـاتن.. لەوانـە کـاك یوسـف زۆزانـی، کـوردێکی رۆژئاوای کوردستان بوو.. پێشتر لە یوگسـلافیا خوینـدکاربوو، زۆر نزیکی مـام جـەلالو کـاك نەوشـیروان بـوو، هـەر جـەلالیش بوو. کاتێك کاك نەوشیروان پێی گوتم کاك یوسف دیتە لاتـان.. من گـوتم کـاك نەوشـیروان ئێمـە هـەموو کـوڕی پیـاوی فـەقیرو خاکین.. ئەو لە ئەوروپا هاتۆتەوەو بە نەستەلە گـەورە بووەو

چۆن لەگەڵ ئێمە هەڵدەکا؟ ئەویش گوتی تۆ نایناسی کوڕێکی چاکو خاکیە..کاتێك کاك یوسف هات خوا هەڵناگری لە هەمووما‌ن خاکیترو عاقڵترو چالاکترو خوێندەوارتر بوو.. ڕۆڵی سەرەکی لە نووسنی وتارە بادینیو عەرەبیەکانی رادیۆکەدا گێڕاو لەڕووی ئیداریشەوە هاوکارێکی گەورە بوو. کاك ئازاد خانەقینیو بارزانی براشی لەوێ بوون، دواتر کوڕێکی فەیلیشمان بە ناوی "رەعد" هاتەلا. هەر لەسەرەتاشەوە کاك ئازاد چالاك لەوێ بوو.. کاك ئازاد چالاك نوسەرێکی عەرەبی زانو باش بوو، هەر خۆشی نوسینەکانی خۆی لەرادیۆ دەخوێندنەوە..ماوەیەك کەسێکی ترمان بەناوی عەدنان لابوو، دوایی شەهید بوو، وابزانم خەڵکی دوبز بوو. رزگاریش خەڵکی هەولێر بوو لامان بوو، جارجارە ئەینووسی.. ئێستا لەسوید دائەنیشێتو بووە بە نوسەرێکی باشو لێهاتوو، لەزمانی کوردیەوە شت وەردەگێڕێتە سەر زمانی سویدیو بەپێچەوانەشەوە. لەم دوایانەشدا خەڵاتی یەکێتی نوسەرانی سویدی پێبەخشراوە.

هەروەها "فەرید ئەسەسەرد" کە خۆی لەدەزگای راگەیاندن بوو، بەرپرسی بەشی چاپەمەنی بوو، جارجاریش نوسینی بۆ ئێمە ئەنوسیو هاوکاری دەکردین..ژنو پیاوێکیش لەوێ بوون بەناوی "شۆخانو......... "، خەڵکی سلێمانی بوون، ناوی پیاوەکەیم بیرنایەتەوە..بەهەرحاڵ رادیۆکە بەپشتیوانیو

هاوکاری هەموو ئەو برادەرانە کەوتەوە ئیشکردن. دوای دانوستانی ساڵی 1984یش کۆمەڵە برادەرێکی دیکە پەیوەندیان بەدەزگای راگەیاندنی یەکێتیەوە کرد لەوانەش کاك شێرکۆ بێکەسو هەڤاڵ کوێستانیو کاك پشتیوانی موهەندیسو سەربەستی موهەندس کە خەڵکی قەڵادزێ بوو.

***خۆت ئەزانی کاری رادیۆ لەو شاخو کێوانەو لەو بارودۆخەدا ئاسان نەبوو، چۆن هەواڵو نوسینو وتارتان دەست دەکەوت، تەنها پشتتان بەو برادەرانە ئەبەست کە باستان کردن؟**

–باوەڕتان بێت شەوی وا هەبووە تا بەیانی نەخەوتووم، چونکە ئەمزانی کارەکە قورسەو هەر بەخەمیەوە بووم.. بەلاّم بێگومان بە پشتیوانی کاك نەوشیروان ماڵی ئاوابێتو هەوڵو ماندووبوونی ئەو برادەرانەو خۆشم کارەکەمان ڕایی دەکرد.. خۆم زۆر ماندوو دەکرد بەدوای رۆژنامەکاندا دەگەڕامو داوام لە هاورێیان ئەکرد وتارمان بۆ بنووسن.. لەوانە کاك مەلا بەختیار کە ئەو سەردەمیش هاوکاری ئەکردینو وتاری بۆ دەنوسین!؟ کاك نەوشیروانیش لەسەر بەڵێنەکەی خۆی بەردەوامبوو، چەند کتێبێکی خۆی بەزنجیرە لە رادیۆ بڵاوکردنەوە، لەوانە "قیادە مۆقەتە لەچ بەرەیەکدا وەستاوە"و "کارەساتی

هەکاری"..شەڕە گەورەکانی دەشکران کاك نەوشیروان خۆی وتاری لەبارەوە ئەنووسین.

مام جەلالیش لەنوسینەکاندا بەشداری دەکردین.. بەتایبەت نوسینە سیاسیەکان.. مام جەلال لەبەر ئەوەی سکرتێری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و کەسی یەکەمی شۆڕش بوو، هەمیشە لەگەڵماندا لە پەیوەندیدا بوو. تەلەفۆنێکی بە هەندرمان لەنێواندا هەبوو..هەموو ڕۆژێك تاوەکو سعات دەی بەیانی دڵمان لەناو مشتمان بوو، دەمانگوت ئەبێ مام جەلال لەبەرنامەکانی دوێنێمان ڕازیی بووبێت، یان ڕازی نەبووە ! ؟ لەلایەکی دیکەشەوە مام جەلال و کاك نەوشیروان بەردەوام ئامۆژگاریان دەکردین و بەشداری زۆریان لەنووسین و پەروەردەکردنمان هەبوو، زۆریش چاویان لێمان بوو.

جارجارەش کاك نەوشیروان خۆی دەدزیەوەو دەهاتە لای ئێمەو چەند ڕۆژێك دەمایەوە. لای ئێمە ژوورێکی بچووك هەبوو، ئەهاتە ئەوێ و شتی ئەنووسی و سەرپەرشتی ئێمەشی دەکرد.. لەخوارەوەش ئێمە بەتایبەتیش"پەخشان خان" خواردنی بۆ دروست ئەکردو بۆمان ئەناردە سەرەوە.. بەمجۆرە وردە وردە رادیۆکە کەوتەوە سەرپێی خۆی و ڕۆڵە گەورەکەی لەنێو شۆڕشی کوردستاندا گێڕا.

***بەرنامەکانی رادیۆ چۆن رێك دەخران، لەکاتێکدا ماوەی بەرنامەکان تەنها سعاتێك بوو؟**

بەرنامەکانی رادیۆمان بەوشێوەیەی خوارەوە بوو، لە سعات دەی بەیانی بەدواوە دەستمان بەتۆمارکردن ئەکرد، ماوەی رادیۆکە راستە سعاتێك بوو. پێنج دەقەی یەکەم قورئان ئەخوێنراو دواتر وتاری سیاسی ئەخوێنرایەوە. پاشان بەپێی رۆژەکان چالاکی پێشمەرگەو بەرنامەی شەهیدان‌و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان‌و ئەدەب‌و شۆڕش دادەنران‌و جارجارەش شیعرەکانی مامۆستا شێرکۆ بێکەسمان ئەخوێندنەوە کە لە شارەوە بۆی ئەناردین.. نیو سعاتی یەکەمی رادیۆ بۆ شێوەزاری سۆرانی بوو، نیو سعاتەکەی دیکەش بەشێکی بۆ شێوەزاری بادینی‌و بەشەکەی دیکەی بۆ بەرنامەکانی زمانی عەرەبی بوو.

بەو هەموو کەموکورتیانەی ئێمە هەمانبوون بەتایبەت لەڕووی داراییەوە، بەڵام هەر کارمان دەکرد. باوەڕ بکە جاری وا هەبوو کاسێتەکانمان چەند جارێك دەسڕیەوەو لەسەرمان تۆمار دەکردەوە. جارجارەش دەنگی بەرنامەی پێشوتری لەسەر دەردەچووەوە. جاری واش هەبوو سەد دینارمان لە"حاجی رەسوڵی توژەڵە" قەرز ئەکردو ئەمانگوت سەری مانگ ئەتدەینەوە..هەموو مانگێك بەقەرزداری، بەڵام بەورەی بەرزو پۆلاین رادیۆکەمان بەڕێوەئەبردو برادەرکانیشمان زۆر بە

لەخۆ بوردووانە کارەکانیان رادەپەڕاندن و نەمانهێشت رادیۆکە یەك دەقەش بوەستێ.

کادیرەکانی ئەوێ نووسەر بوون، بێژەربوون، موهەندیس بوون، سەرباری ئەمەش ئەبوایە لەسەرماوسۆڵی زستان بچن دار بۆ سۆپاو چێشت لێنان بهێنن و کارەکانیش بەنۆبەت دەکران و هەمووان خەفەریاتیان ئەگرت.. منیش، پاش ماوەیەكماڵیان ئاوا بێت منیان لەخەفەریاتەکە بوارد.. بەڵام "پەخشان خانی خێزانم و کاك یوسف زۆزانی" کارەکانیان هەر دەکرد. ژیانی ئەوێ زۆر سەخت بوو جاری وابووە ئەو سۆندە ئاوەی لەکانیەکەوە ئاومان پێهنابووە بارەگا دەیبەست و چەند رۆژێك بێ ئاو ئەبووین، دەبوا سۆندەکە بەئاوی گەرم یان بە ئاگری پەرەمێز خاو بکەینەوە. زستانی توژەڵە ئەوەندە سەرماو سایەقە بوو چەندین جار لەماڵەکەی خۆم لەبەر بەفر دەرگام لێ دادەخراو دەبوایە پێشمەرگەکان فریامان بکەون و دەرگامان لێ بکەنەوە. ژیانی ئەوێ وەك ژیان و کۆمۆنەیەکی پاریس وابوو، دەبوو هەموو ئیش بکەن و خواردنی هەمووشمان وەك یەك بوو.

***کەی بارەگای رادیۆتان لە توژەڵەوە گواستەوە، دواتر بۆ کوێ چوون؟**

-لەساڵی 1983 پێشمەرگەکانی حزبی دیموکرات و کۆمەڵە شەڕێکیان لەگەڵ سوپای پاسدارانی ئێران لێدروست بوو. رۆژێك لەژێر کەپرەکەی لای مام جەلال لە توژەڵە بووم، پاییزی ساڵی 1983 بوو، شەهید قاسملو لەگەڵ ئەندامێکی دەفتەری سیاسی حزبە کەیان هاتنە لای مامجەلال و دانیشتن و ئەوان گوتیان مام جەلال ئێمە لەگەڵ ئێراندا لەشەڕێکی قورسداین و پێویستمان بەهاوکاریی ئێوە هەیەو بەتەنها دەرەقەتی هێزەکانی ئێران نایەین.. دواتر مام جەلال لەو بارەوە کۆبوونەوەیەکی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی رێکخست و لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیاردرا یەکێتی نیشتیمانی کوردستان هێزی پشتیوانی بۆ بەهاناوەچوونی کوردانی رۆژهەڵات بنێرێت. ئەوە بوو هێزێکی گەورە کۆکرایەوەو بەرەو سنوورەکان بەرێکەوتن و مام جەلال خۆی سەرپەرشتی هێزەکەی دەکرد. "مەلا عەبدوڵڵای حەسەن زادە"ش کە ئەوسا جێگری شەهید قاسملو بوو، وتارێکی بۆ رادیۆکەی خۆیان نوسی و خوێنرایەوەو لەوتارەکەدا ناوی لەهێزی یەکێتی نا "هێزی پشتیوانی"..ئەو شەڕە شەڕێکی زۆر قورس بوو، ژمارەیەك لەپێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان شەهیدو بریندار بوون.. بەداخەوە یەکێك لەوانەی لەو شەڕە پەکی کەوت و برینداربوو.. "ملازم خولە"ی خزمی من بوو. دوایش ملازم خولە دوای چەندین ساڵ بەهۆی ئەو برینداریی و

پچڕانی بڕبڕەی پشتی لەسەر عەرەبانە بوو..بە کولە مەرگی ژیا..کیژخانی خێزانی زۆر خزمەتی کردو منداڵەکانی بۆ بەخێوکردن.. دوایی چوونە سویدو لەوێ ژیان..بەڵام بەداخەوە ملازم خولە خۆیو کوڕێکو برایەکی بەکارەساتی ئۆتۆمبیل کۆچی دواییان کرد.

لەو شەڕەدا کە چەندین ڕۆژی خایاند، هێزەکانی یەکێتیو هێزەکانی حزبی دیموکراتو کۆمەڵەی کوردستانی ڕۆژهەڵات شکانو خۆیان لەبەر هێزو سوپای پاسدارانو تۆپخانەکانیان نەگرت.. دوای شکستەکە ئێران کەوتە تۆپبارانی بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ناوزەنگ. بۆیە سەرکردایەتی بڕیاریدا بارەگاکانی خۆی لە ناوزەنگو توژەڵەوە بۆ ناوەوەی خاکی کوردستانی عێراق بگوازێتەوە. یەکەمین گروپیش کە لەمانگی 3ی ساڵی 1983 دەستی بە گواستنەوە کرد، دەزگای ڕاگەیاندن بوو. تەواوی کەلوپەلەکانمان بەپشتی وڵاغ گواستنەوەو بردنمان بۆ گوندی"باوزێ"ی پشتی قەلادزێ..هەرچی هێزەکانی دیکەش بوون چوونە بەرەی شەڕەکانەوە.

لەقەلادزێ لەناو خێمەو خانووی بەنایلۆن دروستکراو دەژیایینو ژیانەکە زۆر قورسو سەخت بوو، ڕاستە بەهار بوو بەڵام زستانو سەرماو سۆڵەکەی کاریگەرییەکەی هەر مابوو، هیچ هێزێکیش لەو ناوچەیە نەبوو. دوای مانگێك مانەوە لەوێ

زانیمان شوێنەکە بۆ کارەکەی ئێمە گونجاو نییە..دیسان جارێکی دیکە بارەگای راگەیاندنمان گواستەوە بۆ "سەرشیو" کە دەکەوێتە نزیك گوندی "گەناوی" بناری شاخی "بەڵفەت"و هەتا مانگی حەوتی هەمان ساڵ ماینەوە.

لەمانگی 7ی ساڵی 1983، ئێران لەپشتی ئەو ناوچەیەی ئێمەی لێبووین لەشاخی "بەڵفەت" هێرشی کردەسەر سوپای عێراق و شەرێکی قورس روویدا، بۆ پاراستنی ئێمەو ناوچەکە سەرەتا کاك مستەفا چاوڕەش بەخۆی‌و هێزێکی پێشمەرگەوە هاتە ئەوێ، بەلاّم شەڕەکە هەر پەرەی دەسەندو تۆپەکان دەگەیشتنە ناو بارەگاکانی ئێمە، دوای ماوەیەك مامۆستا"جەمال تاهیر"و ناوەندی کۆمەڵەش هاتنە ئەوێ..لە ئەنجامی تۆپبارانەکان مەکتەبی سیاسی‌و سەرکردایەتی مەجبوور بوون بارەگاکانیان لە ناوزەنگ بۆ ناوچەی بالیسانی دۆڵی خۆشناوەتی بگوازنەوەو "مام جەلال"یش بارەگاکەی خۆی بردە گوندی خەتێ. بەهۆی فشاری شەڕی ئێران عێراق‌و گەیشتنی تۆپەکان بۆ ناو خێمەو بارەگای دەزگای راگەیاندن..لەپڕ شەوێك خۆمان پێچایەوەو هەموو کەلوپەلەکان‌و چاپخانەو دەزگاکەمان بۆ گوندی "بەرگەلۆ"ی دۆڵی جافایەتی گواستەوە.

***ئەو کات لەناو خەڵکدا دەگوترا شۆڕش دوو رادیۆی هەیەو یەکیان یەدەگە، ئایا ئەم قسەیە راستی تێدابوو؟ یان تەنها هەر ئەو رادیۆیە بوو کە پەخشی بڵاودەکرایەوە؟**

-لەبارەی ئەوەی شۆرش، یان یەکێتی نیشتمانی کوردستان دوو رادیۆی هەبووبێت..لەسەرەتای هەشتاکاندا تەنها یەك جیهازی پەخشی رادیۆمان هەبوو، ئەویش لە توژەڵەبوو..ئەو جیهازە بوو کە پەخشمان پێدەکردو ئەوسا هیچ جیهازێکی یەدەگمان نەبوو..پەیدابوونی جیهازی یەدەگ دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی هەشتاکان..ئەو کاتەی ئێمە لەژێرگوشاری شەڕی نێوان کوردانی رۆژهەڵات "حزبی دیموکراتو کۆمەڵە"و ئێران، بارەگاکانمان بەراگەیاندنیشەوە گواستنەوە بۆ باوزێو سەرشیوو قزڵبەگو لەوێشەوە بۆ بەرگەڵو..کە هاتینە بەرگەڵو جیهازێکی دیکە پەیدا کراو بوو بە دوو جیهازی پەخشی رادیۆ..کە ئەنفالی دۆڵی جافایەتی دەستی پێکردو هێرشەکانی سوپای عێراق بە زیاتر لە دوو فەیلەق هاتنەسەرمانو گەمارۆکان توند دەبوون..بەناچاری بەئەمری کاك نەوشیروان یەکێك لە جیهازەکانمان کە یەدەگ بوو بە چەند کادرێكو ئەندازیارێکەوە ناردنە سەر سنوری ئێرانو ناوچەی دۆڵەکۆکەو گوێزی، کە شوێنێکی زۆر سەخت بوو، رادیۆکەی تریشمان کە لە بەرگەڵو بوو دوای شەڕی ئەو ناوچەیەو سەرکردایەتی کەوتە دەست حکومەتی عێراق.

***ئایا لە "بەرگەلّو" شوێنی ئەوەتان هەبوو دەزگای راگەیاندنی لێدابنێن؟ ناوچەکە پێشمەرگەی لێبوو ئەوکات؟**

–کە هاتینە بەرگەلّو هاوینی سالّی 1983 بوو، هیچ شوێنێکمان نەبوو، دوو کەلاوەژوور لەوێ هەبوو، نازانم بۆچی دروستکرابوون، ئەو دوو ژوورەیان داینێو چەند خێمەیەکیشمان هەلّدان. بارودۆخەکە بەشێوەیەك بوو مەجبوور بووین هەموومان خاوخێزانمان بنێرینەوە بۆ شارەکانو تەنها خۆمانماینەوەو جارێکی دیکە دەستمان کرد بە وەگەڕخستنەوەی رادیۆکەمانو رادیۆکەمان بردە جێگایەکی سەختی نێوان دوو شاخ، چەندین جار کە فڕۆکەش بۆردومانی ئەکردین، بەلاّم رادیۆکەمان هەر پارێزراو دەبوو. بارەگاکانی دیکەشمان لە بناری شاخەکانی بەرگەلّوو دامەزراندن. ئێستاش ئەو خانوانە دروستکراونەتەوەو وەك میراتی شۆڕش نۆژەنکراونەتەوەو هێشتویانەتەوە، مالّیان ئاوابێت. سەرەتا کە هاتینە ئەوێ دەستمان بە خانوو دروستکردن کرد.. بارەگای رادیۆ هەر لە بەرگەلّو بوو، بەلاّم بنکەی چاپخانەمان بردە نێوان سەرگەلّوو بەرگەلّو..چەمێکیان لەنێواندا بوو. دواتر ئەو ناوچەیە بوو بە شوێنی ناوەندی کۆمەلّەو مالّی کاك نەوشیروانو مالّی دکتۆر فوئاد مەعصومو بارەگای ناوەندی شۆڕشگێڕانو "زیندانی شۆڕش"یش هەر لەنزیك ئێمە بوو.

لـەو بەریشـەوە لـەنزیك چـاپخانەی دەزگـای راگەیانـدن، نەخۆشـخانەی شـۆڕش دامـەزرێنراو لەدامەزراندنەکەشـیدا "د.شوان ئاکرەیی" رۆڵی باشی گێـڕا، دواتـر دکتـۆر شـوان لـە حکومەتی هەرێمی کوردستان بوو بە وەزیری مافی مرۆڤ. جگە لەو "د. حوسێنو د.ئارام رۆسـتەم"یش لـەوێ بـوون. د.ئـارام ئێستا لە وەزارەتی تەندروستی کوردستان راوێژکارە، هەروەها د. ئـەدیب کـە بـە د.هـەلۆ ناسـراوە دکتـۆرێکی نەشـتەرگەری گـەورەی ناوچـەی بادینـان بـوو، لـەوێ کـاری نەشـتەرگەری دەکرد.

بەزستانان لە نێو خانوەکاندا ئەماینەوەو هاوینانیش لەسەر لێواری چەمەکەی نێـوان سـەرگەڵوو بەرگـەلو، لـەبن دارگـوێزە گـەورەکان دەماینـەوەو خێمـەمان لـێ هەڵـدەداو هەنـدێك شوێنیشـمان چـیمەنتۆ کردبـوون، کـاتێکیش کەسـوکاری پێشمەرگە سەردانی ئەکردین.. ئەیانگوت خۆزگەمان بـەخۆتان جێگاتان خۆشـە. وایـان ئـەزانی لـە سـەفرەو گەشـتین، نـەیان ئەزانی ئەگەر شەڕ دەستپێبکاتەوە رۆژانە تۆپبـاران ئـەکرێینو فڕۆکە جەنگیەکانی عێراق بۆردومانمان ئەکەنو ژیانمان لێ تاڵ ئەکاو پێشمەرگەمان شەهیدو بریندار ئەبن.

جارێکیـان کەسـێك بـەناوی "مـام عوسمـان" کـە چێشـتخانەیەکی بچـووکی لـەنزیك بارەگاکـانی ئێمـە هـەبوو بەهۆی بۆمبارانـەوە خـۆیو دوو کـوڕی شـەهیدبوون، جـارێکی

دیکەش مامۆستا یاسینی پێشمەرگەی رادیۆ بەداخەوە بەهۆی فرۆکەوە شەهید بوو.. مامۆستا یاسین خەڵکی سلێمانی بوو.

***بۆ وا باسدەکرێت کە لە رادیوکەتدا هەولێرچیەتیت کردووە؟ ئایا ئەمە راستە، یان تۆمەتە؟**

جارێ رادیۆکەمان بۆخۆی لەناوچەی سلێمانی بوو، من بەحوکمی نزیکیم لە سلێمانی چونکە پەخشانخانی خێزانم خەڵکی سلێمانی بوو، هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردوە کە سلێمانچێتیو هەولێرچیەتی چیيە!؟ چونکە من خۆم کۆمەڵەبوومو بەناوی ئومەمیەتەوە خەباتم ئەکرد، نەك ئەم شارو ئەوشار.. تۆ خۆت بگەڕێنەوە بۆ تەمەنی سی ساڵیو سەرەتای هەشتاکانی سەدەی رابردوو، بزانە ئێمە چەند دەروێشی کۆمەڵەو مارکسیەتو ئومەمیەت بووین.

بەڵام بۆ ساغکردنەوەی ئەو رایە ناڕاستە! ئەمەوێ بڵێم بەدرێژایی تەمەنی رادیۆ دوو ئەندازیاری هەبوون کەرکووکی بوون بەناوەکانی "رێبواری موهەندس، کە مێردی ئاشتیخانی کچی برایمە ئەفەندی"و "رەنجەی موهەندیس" کە دواتر لە حکومەتی هەرێمی کوردستان بووە وەکیل وەزیری گواستنەوەو گەیاندن. کاك پشتیوانی موهەندیشمان هەبوو کە دواتر بووە زاوای ماڵی ماموستا ئەحمەد هەردیو مێردی

دکتورە ڕێزان بوو..ئەوانە بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵانە کاری تەکنیکی رادیۆکەیان دەکرد..دوو کەرکوکیو یەك سلێمانی.

بێــژەرەکانیش.. فــەرهاد ســەنگاوی کــە ناوەکــەی بەخۆیەوەیـەو حـاکم فـەرهادیش کـە ئێسـتا لـە تـەلفزیۆنی "کوردستان 24" بێژەرەو کوڕی مەلا رەسوڵی هەڵـەدنی دۆڵـی جافایەتیە بوونو ماوەکیش شێخ جەمال کە خەڵکی سلێمانیە لەوێ بوو. ئەوانـە بێـژەری سـەرەکی بەشـی سۆرانی رادیۆکـە بوون. ئینجا جارجارەش سەربەست حوسێن کـە ئەنـدازیاری شارستانیو خەڵکی قەڵادزێ بوو، وەکو نوسـەرو بێـژەر کـاری لەوێ ئەکرد. ئەمانـە هـەموو سـلێمانی بـوونو یـەك هـەولێریان تێدا نەبوو..بەشی بادینی رادیۆکەش زێرەڤانو خالید دۆسکیو شـوان ئـاکرەیی پێشکەشـیان دەکـردو بەرنامـەکانیان بـەڕێوە دەبـرد. بەشـی عـەرەبی رادیۆکـەش ئـازاد چـالاکی، کـوڕی مامۆستا رەفیق چالاکی رەحمەتی بـوو، ئـەویش هـەر خـەڵکی سـلێمانی بـوو.. ئـەوەی وەك هـەولێری لـەوێ بـوو فەریـد ئەسەسـەرد بـوو، نوسـەری زمـانی عـەرەبی بـوو، بـۆ بەشـی سۆرانیشی ئەنووسی. یوسف زۆزانیش کـەوا کـوردی رۆژئـاوای کوردستان بوو، بۆ بەشی بـادینیو عەرەبیەکەشـی ئەنووسـی، هەروابێتەوە بەرپرسـی پێشـمەرگەکانیش کـاك شـێرکۆ جـدی بـوو سـلێمانی بـوو، دواتـر بەداخـەوە شـەهید بـوو. کـوڕێکی دیکـەی سلێمانیشـی لێبـوو بـەناوی هـێمنو خـەڵکی مـاوەت،

ئەویش شەهید بوو. مام عەلی جێگری کەرتەکەش هەر خەڵکی ماوەت بوو. دواتر کەسێکی دیکەی خەڵکی سەرگەڵو بەناوی عەلی ئەحمەد بەگ، بووە بەپرسی پێشمەرگەکانی رادیۆ.. ئیتر نازانم هەولێرچیەتیەکەی من لەکوێ بووەو چۆن بووە؟!

***بیستوومە کادیرو پێشمەرگەکان تۆیان پێ کەسێکی بۆرژوازیی بووەو پێیان وابووە وەك ئەوان نازیت؟**

–ئەوە چونکە کاك یوسف زۆزانی لە ئەوروپاوە هاتبووەوە حەزی لە قاوە بوو، منو پەخشانیش راستی هەر حەزمان لەقاوە بوو.. جار جارە میوانیشمان هەر دەهاتن.. میوانی هەر کەسێك هاتبایە ئەبوایە بەیەکەوە لەیەك ژوور بخەوین.. چونکە ژووری ترمان نەبوو بۆیە من ناردمە شارو چەند بەتانیەکی زیادو هەندێ قاوەو نسکافیو تەبقەیەك هێلکەش کە بەشی مانگێکی دەکردین بۆم هاتن.. جار جارەش قوتوێك گۆشتم بۆ پەخشان دەکڕی.. خۆت ئەزانی پەخشان لە بنەماڵەیەکی ناوداری سلێمانیو لەنەوەی شێخ مەحمودی حەفید بوو..ئەگەرچی زۆریش سادەو خاکی بوو..لەپێشمەرگەکان خاکیتر بوو.. بەڵام من دەمویست چاوم لێبێتو خۆشت ئەزانی تازە بووك بوو، ئەبوا نازی هەڵبگرم..

هەموو سەرە مانگێك کۆبوونەوەی دەزگای راگەیاندنمان هەبوو، کۆبوونەوەکان زۆر قورس بوون.. لەچارەسەری

کێشـــەی ئیســـرائیلو فەلەســـتینیەکان قورســـتر بوو..چـــونکە هـەموو ئـەو برادەرانـەی لـە کۆبوونەوەکـە بـوون خۆیـان بـە مارکسـی عـەیار بیســتو چـوار ئـەزانیو لـە گفتوگۆکانیشـدا هەمیشە درێژ دادڕی دەکرا. بەیانیەکیان لەماڵەوە دەرچووم بۆ کۆبوونەوەی سەرکردایەتیو سەردانێکی ماڵی مام جەلالو کاک نەوشیروانم کرد.. نێوانی ماڵی ئێمەو بارەگای مام جەلالو کاک نەوشیروان، بەپێ هەر 45 خولەکێك دەبوو..پـاش نیوەڕۆکـەی کە هاتمەوە دەبینم پەخشان بێ تاقـەت دیـارە، گـوتم هـا چـی بووە.. گوتی هـاتوون ماڵەکـەیان تـەفتیش کـردووینو بەتانیـە زیادەکانو قاوەو نسکافیو هێلکەکانیشیان "تەئمیم کردووە"و بـردووە. منـیش گـوتم راوەسـتە بـزانم چـییە؟ کـاك یوسـف بەپێکەنینەوە گوتی وەلاهی کاکە هی منیشیان بردووەو هەموو بارەگاکانو ماڵەکان گەڕاونو گوتوویانە ئێمە مارکسین.. چۆن دەبێ تۆ لەماڵەوە هێلکەو نسکافی بخۆیو جلوبـەرگو بـەتانی زیادەتان هەبێو ئێمەش ئەو شتانەمان نەبێت!.

ئێوارەکـــەی کـــاتی کۆبوونـــەوەی راگەیانـــدن هـــاتو لـــە کۆبوونەوەکەشدا دیسـان گوتیـان ئێمـە هـەموومان مارکسـینو ئەوەی ئێوە ئەیکـەن ژیـانی بۆرژوازیانەیـەو ئێمـەش ئەمـەمان قبوڵ نییەو ئێمە بۆیە بوین بەکۆمەڵـەو هاتوینەتـە ئـەو شـاخو کێوانە تاوەکو هەمووماڵ وەك یەك بژین..دواتر من قسەم کردو گوتم قسەکانتان راستە.. بەلام جیاوازییەکانی نێوانمان چیین..

گوتیان تۆ دوو بەتانیت لەماڵەوە زیادبووەو قاوەو نسکافیو هێلکەتان لە ماڵ هەبووە..جا خۆ هەمووشیان بردبوو...ئەوەی قسەی لەگەڵم دەکرد جگەرەیەکی رۆسمەنی بەلا لێوەوە بوو.

منیش گوتم ئێوە پێویستان بە بەتانیە، ئەگەر کەسێك سەرمایەتی با بەتانیترتان بۆ بنێرم. گوتیان نا، بەلام ئەو رەفتارەی تۆ رەفتارێکی بۆرژوازیانەیە..نابێ شتی زیادت لەماڵەوە هەبێت. گوتم منو کاك یوسف حەزمان لە قاوەیە.. گوتیان نابێت..گوتم ئەی ئەو جگەرەیەی دەمی تۆ چییە؟ بۆرژوازیانە نییە!؟ خۆمن نیو ئەوەندەی جگەرەکەت مانگانە پارە لە قاوەو نسکافێکە سەرف ناکەم.. گوتی ئاخر من حەزم لە جگەرەیەو ناتوانم تەرکی بکەم.. منیش گوتم ئێمەش حەزمان لە قاوەیەو ناتوانین تەرکی بکەین.. بەهەرحاڵ کۆبوونەوەکە دووسێ سعاتی خایاندو وەك نیمچە شەڕێك وابوو. دواتر گوتم بەتانیو شتەکان بۆخۆتان، بەلام جارێکی دیکە کەس نابێتو حەقی نییە ماڵەکەم تەفتیش بکات.. ئەگەر نوقسانیتان هەیەو بارەگاتان کەموکورتی هەیە پێم بڵێن بۆتان پەیدا دەکەم. ئەمەش ژیانی ناوزەنگ بوو.

مەسەلەی جلوبەرگ لەبەرکردنی زیادیش، من جلی هاوینەو زستانەم هەڵدەگرت بۆ ساڵی داهاتوو، بۆیە دوو جلکم هەبوو. بەلام پێشمەرگەکان جلە وەرزییەکانیان فڕێ دەدا.

## هەڵسەنگاندنی دەزگای راگەیاندنو رای جیاواز

***پێتوایە کارەکانی ئەو کاتەی دەزگای راگەیاندنو رادیۆو بڵاوکراوەکان لەئاستێکی بەهێزدا بوون؟ چ شتێکتان کرد کە تازە بووبێتو شایەنی باسکردن بێت؟**

-دیارە ئەوسا ئێمە گەنج بووینو لەو شاخو کێوانەدا فێرە شتەکان بووین، بەلام دوایی دەزگای راگەیاندن بووە مەدرەسەیەك بۆ پێگەیاندنی چەندین کەس کە بوونە نووسەری باشو خاوەن دەنگی زوڵاڵ.. بەهەرحاڵ دەزگای راگەیاندنو رادیۆ توانیان بەبێ پسانەوە ئیشو کاری خۆیان بکەن. ئێمە ناڵێین کارەکانمان لەئاستی پراڤداو واشنتن پۆست بوونو ناشلێین رادیۆکەمان لەئاستی "BBc"یدا بووە..بەلام هەرچۆنێك بوو دەنگێکی زوڵاڵی شۆڕش بوو. بەهەموو باشیو کەموکورتیەکانیشەوە خەڵك هەموو رۆژێكو ئێواران بە تامەزرۆییەوە چاوەڕێی گوێگرتن لە رادیۆو راگەیاندنی شۆڕشی نوێ بوون. بەڵێ بەپێی ئەو رۆژەگار کاری باشمان ئەنجامدا.

***هەڤاڵ کوێستانی کە ئەندامێکی مەکتەبی ڕاگەیاندنی ئەوساکە بووە، لاوازی ڕادیۆی شۆڕش دەداتە پاڵ تۆو دەڵێت، کاك نەوشیروان مستەفا لێپێچینەوەی لەگەڵدا کردووی؟** ...نەو ڕۆژانەی نیشتیمان هی هەموومان بوو....لا 246.

–لەبارەی کاك هەڤاڵ کوێستانی کە لەنووسینەکەی خۆیدا زۆر باسی لێهاتووی خۆیو بێتوانایی کەسانی دیکەو ئیمەمانان دەکات. ئەڵێم گەردنی ئازاد بێت! هەڤاڵ نوسەرێکی باشە، شاعیرێکی هەست ناسکە، پیشمەرگە بووە، بەدرێژایی تەمەنی خۆمان دڕدۆنگیەك لەنێوانماندا پەیدا نەبوو. بەلآم بۆ مێژوو دەیڵێم تاکە کەس لەو هەشت نۆ ساڵەی من لێپرسراوی دەزگای ڕاگەیاندنی"ی.ن.ك" بووم لەشاخ، بەرەسمیو وەك بەرپرسی ڕادیۆ تەنها کاك"ڕێکەوت عوسمان"بووە هاتۆتەلامان. زۆر هاوکارو برادەربووین، ماوەیەکی کەمیش مایەوەو دواتر بوو بە بەرپرسی ڕێکخراوی کۆمەڵە لە ناوچەی هەولێر. ئەگینا هیچ کەسی تر بەناوی بەرپرسی ڕادیۆ نەهاتۆتە لای ئێمە.

بەلآم دیسان ئێوە ئەمە بێننەوە بەرچاوتان، تەمەنی من سیو شتێك ساڵ دەبوو، چوارساڵ لەزیندان بووم، گەنجێك بووم. ئەم ئەرکەی لەسەرشانم بوو ئاسان نەبوو! خۆشم بیرمەندو فەیلەسوف نەبووم مەدحی خۆم بکەم. بەلآم باشیەکەی ئەوەبوو بەهاوکاری هەموو لایەك توانیمان ڕادیۆکە

بەردەوام بکەینو ڕۆژنامـەی شـەرارەو ڕێبـازی نـوێ بـەردەوام بن. هەتا ئێمە بەرپرس بووین لـەوێ لەگـەڵ "یوسـف زۆزانـیو کاك فەرید ئەسەسـەرد"و هاوڕێیـان نەمانهێشـت یـەك ڕۆژ ئـەو کارانە دوابکەونو رادیۆکەش راوەستێت. باشو خراپ..لێهاتوو بـووبین، یـان نا..کردوومانــە. بـەڵام دیســان ئـەوە دێنمــەوە بەرچاوی خوێنەر تاکە وەسیلەی وەرگرتنی هەواڵمان بۆ رادیۆ، پۆستو نامەی ناوشارەکان بوو، بەنامـەی چـوکلێتی ئـەهاتنو جاری وابـوو بـەماوەی مانگێـك دەگەیشـتن، ڕۆژنامـە عێراقــیو ئەورووپیەکانیش هەروا درەنگ دەگەیشتن. هیچ سەرچاوەیەکی هەواڵمان نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا رادیۆکەمان بەردەوام بوو.

زۆرجار خۆم خێمە بە خێمەی پێشـمەرگەکان دەگـەڕام، بـۆ ئەوەی شتێکم دەست بکـەوێتو بـزانین لەسـەر چـی بنوسـین، دەمگـــوت چـــیتان پـــێ باشــــە لەبارەیـــەوە بنوســـینو قسەبکەین..چونکە هیچ شتێکمان بەردەست نـەدەبوو. ئینجـا نووسینی ڕۆژانەی وتاری سیاسی بـۆ هێزێکـی شـەڕکەری وەك یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ئاسـان نـەبوو. لەبـەر ئـەوە مـن خوا خوام بوو یەکێك هاوکارمان بێتو وتارمـان بـۆ بنووسـێ.. تەکلیفم لە مـام جـەلالو کـاك نەوشـیروانو کـاك مەلابـەختیارو هەموو کەسێك دەکرد وتارمان بۆ بنووسن، خۆم پێم خۆش بوو هەموو کەسێك هاوکارمان بێت..کاك هەڤاڵیش کۆمـەڵێ وتـاری زۆرباشی نوسی..دەستی خۆش بێ .. بەڵام ئەوەی کاك هەڤاڵ

لەکتێبەکەیدا نوسیویەتی و دەڵێ کە دەڕۆیشتم وتاری مانگێکم بۆ رادیۆ جێ دەهێشت. پێم سەیرە..ئێوە دەخەمەبەر ویژدانی خۆتان، رادیۆی شۆڕش کە رادیۆیەکی سیاسی بوو، ئایا وتاری سیاسی بۆ مانگێك بەجێ دەهێڵرێت. وتاری سیاسی ئەبوا رۆژانە بینووسی.. بەڵێ بەرنامەی شەهیدان و بەرنامەی ئەدەبی ئەتوانرێ بۆ دوو مانگیش ئامادەبکرێت و بەجێبهێڵرێت کە هەموو کەس دەتوانێ ئەوە بنوسێ.. بەڵام وتاری سیاسی بەپێی رووداوەکان و سیاسەتی رۆژانەی یەکێتی دەنوسران.

ئینجا کاك هەڤاڵ باسی ئەوەی کردووە گوایە ئێمە بێ کەفائەت بووین و ئەو کەفائەتی زیاتر بووە.. با وادابنێین راستەو قسەکەی وایە.. بەڵام ئەی کە هاتینەوە شار، بۆچی شۆرش و یەکێتی سودی لەو کەفائەتەی ئەو نەبینی؟ بۆچی هیچ پلەو پایەیەکی پێنەدرا؟ جۆرەها رۆژنامەو رادیۆو دەزگای رۆشنبیری هەبوون و دروست بوون، ئەی بۆ ئەو"کاك هەڤاڵ"ە، نەبووە بەرپرسی یەکێك لەو شوێنانە؟

من دەزانم شاعیر بەحوکمی کارەکەی کەسێکی خودییە، هەندێك "زاتیە".. بۆیە با بڵێین ئەو هەندێ لە ئێمە باشتر بووە، بەڵام نەك بەو ڕادەیەی ئەو خۆی کردووە بە بیرمەندو رۆستەمی زاڵ و کەسانی تریشی کردووە بە هاوڵاتی سادەو هیچ نەزان. لەدوای ڕاپەڕین کە من هاتمەوە نەخۆش بووم، قاچم شکابوون بەدوو دارشەق دەڕۆیشتم. کەچی هەڤاڵانی مەکتەبی

سیاسی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان داوایان لێکردم سەرپەرشتی ئەو لیژنەیە بکەم کە ئامادەسازییان بۆ دەرچواندنی رۆژنامەیەکی رۆژانە دەکرد. دواتریش بووم بە یەکەمین سەرنووسەری ئەو رۆژنامەیە کە "کوردستانی نوێ"بوو. ئەی باشە خۆ کاک هەڤاڵ ساغ و سەلیم بوو..نەخۆش نەبوو.. بۆچی ئەو داوایەیان لەو نەکرد؟ ..ئەگەر بشڵێ لەدوای شاخ وازم لە حیزبایەتی هێناوە. ئەی نەبوو بە "گۆڕان"و لەسەر لیستی ئەوان نەبووە پەرلەمانتار لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق..؟!

لەساڵانی نەوەدەکان بەندە لەیەك کاتدا ئەندامی پەرلەمانی کوردستان و سەرنووسەری رۆژنامەی کوردستانی نوێ و لێپرسراوی مەڵبەندی هەولێر بووم. ئەی ئەگەر پیاوێکی وەکو کاک هەڤاڵ ئەوەندە بە توانا بوویێت بۆچی کەس بیری لێ نەکردەوە تا ئەرکێکی پێ بسپێرن؟! ئەی بۆچی یەکێك لەو ئەرکانەیان بە کاک هەڤاڵ نەسپار؟! با پێم بڵێ دوای هاتنەوەمان لەشاخ، چ ئەرکێکی شیاویان پێ سپاردووە؟!

دەپرسم ئەگەر هەندە بێتوانا بووین ئەی بۆچی ئەو هەموو ساڵە بەرپرسی دەزگای راگەیاندنی یەکێتی و دواتر بەرپرسی مەکتەبی رێکخستن بووم؟ بۆچی بووم بە وەزیر و پەرلەمانتار و جێگری سەرۆکی پەرلەمان و سەرۆکی پەرلەمان؟ ئەی کاک هەڤاڵ کوا کەفانەتەکەی تۆ لەکوێ بوو!؟ ئایا ئەو هەموو

خەڵکە دژی کاك هەڤاڵ بوون؟..کاك هەڤاڵێك بەپێی قسەکانی خۆی بێت لەنامەکانیدا ڕێنمایی مام جەلال و کاك نەوشیروان و کاك مەلابەختیاری کردووە.. ئەی بۆچی ئەوان لایان لێ نەکردەوە. بەڵام نایشارمەوە کاك هەڤاڵ زۆر هاوکاری کردووین، لە رادیۆ پشتیوانی کردین و سوپاسی ئەکەین. کاك شێرکۆ بێکەسیش ماوەیەك لەرادیۆکە لەلامان بوو، زۆر ئیشی نایابی بۆکردین و رادیۆکەیان دەوڵەمەندکردبوو.. من پێم خۆش بوو سەد کەسی وەك کاك شێرکۆ بێکەس و کاك هەڤاڵ لەرادیۆبن..بەڵام با کاك هەڤاڵ یەك بەڵگە بێنێ کەوا ڕۆژێك لەڕۆژان ئەو بووبێ بە بەرپرسی رادیۆ.. بەڵێ من خۆم هەمیشە داوام دەکرد خەڵکمان بۆ بنێرن، کەسانی نوسەرمان بۆ بنێرن، تاوەکو شتمان بۆ بنووسن. چونکە رادیۆ پێویستی بە نووسین و بابەتی ڕۆژانە هەبوو، وتار نووسینی ڕۆژانە هەروا شتێکی ئاسان نەبوو.. ئێستاش ئاسان نییە.

دووبارەی دەکەمەوە کاك هەڤاڵ وەکو شاعیرێك، کەسێکی هەست ناسك و نوسەرەو بەڵام غەدر لەخۆی دەکا، خەڵك چەواشەبکاو غەدر لە هەڤاڵەکانیشی بکا..ئاسایی نییە، چونکە خەڵك ئێستا ژیانی ڕۆژانەو ڕووداوەکان بەچاو ئەبینن و دەخوێننەوەو لەهیچ رابردووێکیش بێ ئاگانین!.

***ئەی هیچ لاوازیەکت لە رادیۆکە دەبینی؟**

-ئەوانەی دەڵێن رادیۆکە لاواز بووە من لێرەدا چەند نمونەیەکیان بۆ باس ئەکەم..سەدان پێشمەرگە بەهاندانی رادیۆکە گیانی خۆیان دەخستەسەر لەپی دەستیانو پەلاماری دوژمنیان دەداو شەهید دەبوون، هازاران هاوڵاتی بەهاندانی دەنگی "فەرهاد سەنگاوی" دەرژانە سەر شەقامەکانو گیانی خۆیان دەخستە بەردەم لولەی تفەنگەکانی بەعس. هەموو ئەو برادەرانە ماونو دەزانن کە مام جەلال لە دانوستانەکەی بەغداد هاتەوە. سەرەتا مام جەلالو شاندەکەی لەگەڵی بوون بە کۆپتەر چوونو دواتر بەسەیارە هاتنەوە گوندی زیخان، لەگەڵ خۆشیدا چەند ئەفسەرێکی گەورەی سوپای عێراقی لەگەڵ بوون. لەگوندی زیخان لەهۆڵێکی گەورە لەگەڵیان دانیشتبوو.. منیش چوومە ژوورەوەو یەکسەر مام جەلال گوتی ئەرێوەڵڵا ئەوە هات.. منیش پێم سەیر بوو.. بەخێرهاتنی میوانەکانم کردو کاک فەرەیدون عەبدولقادریش هەڵیدایەو گوتی مەترسە.. مەترسە من خۆم کردووە بە بەرپرسی رادیۆ..منیش گوتم جا خۆ حکومەتی عێراقی ئەوەندە بێ ئاگا نییە نەزانێ کێ بەرپرسی رادیۆیەو کێ لە راگەیاندن کاردەکا..ئەفسەرەکانیش بەلاقرتێوە گوتیان نایەی بۆ بەغداد.. منیش گوتم کە مام جەلال بێتو وەفدی یەکێتی بێن بۆ بەغداد.. من بۆ نایەم! ئەمە ئەنجامی ئەوە بوو کە رادیۆکە گرنگی خۆی لەنێو شۆڕشدا هەبوو، چونکە ئەوان باسیان لە

رادیۆکە کردبوو.. گوتبوویان ئەبێ رادیۆکەشتان بەرنامەکانی کزبکات تاوەکو دانوستانەکان تەواو دەبن.. ئێمە رادیۆکەمان تەنها ئێواران پەخش دەکردو رۆژی دواتر سعات حەوتی بەیانی دووبارەمان دەکردەوە.. کەچی حکومەتی عێراق داوای کردبوو لێژنەیەکی هاوبەشی راگەیاندن لەنێوانماندا پێك بهێنرێت..

رادیۆکەمان بەو شەق و شرپەوە کە رۆژانە تەنها سعاتێك پەخشی بەهەموو بەشەکانی"سۆرانیو بادینیو عەربی"یەوە هەبوو، لە بەرامبەر ئەو دەزگا زەبەلاحەی راگەیاندنی حکومەتی عێراقی وەستابووینەوەو رووبەڕوویان بووینو ئەوانیش مەمنون بوون لێژنەی ئیعلامیان لەگەڵ دروست بکەن..ئەمە سەلمێنەری ئەوەیە کە دەزگای راگەیاندنو رادیۆکەشمان لاواز نەبوون.

***جارێك لە خۆتم بیستووە کە بێژەری رادیوی گەلی کوردستان "فەرهاد سەنگاوی"، ئەو بێژەرەی دەنگی زوڵاڵی شۆڕش بوو، تۆ هێناوتە بۆ رادیۆکە؟ چۆن بوو هێناتە ئەوێ؟**

–رۆژێکیان چەند برادەرێك هاتنە لامو گوتیان گەنجێك بەناوی "فەرهاد" لە دەزگای راگەیاندن هەیەو خەڵکی ناوچەی سەنگاوەو "فەرهاد" دەنگی لەگۆرانی گوتندا زۆر خۆشە!.. لەگەڵ مامۆستا جەعفەریش ناکۆکی هەیەو لەیەکتر نارازین.. بۆ وا ناکەی بێتە لای ئێمەو لێرە سودی لێ ببینین. منیش رۆژێك بەدوامدا نارد.. دووری نێوان بارەگای دەزگای

راگەیانـدنو رادیـۆو چـاپخانەو ماڵەکـەمان هەرچـەند سـەد مـەرترێك دەبـوو.. کاتێـك بەدوامـدا نـارد هاتـە لامو پـێم گـوت دەمانەوێ بـۆ رادیۆکـە سـودت لێـوەربگرینو وەك بێـژەر بێـی لەرادیۆکـە کاربکەی!..چـونکە ئـەویش لای مامۆسـتا جەعفـەر بێزاربـوو.. لەسـەر داواکـەمان رازی بـوو.. خـوا شـاهیدە کـە یەکـەمجار فـەرهاد هاتـە رادیـۆو دەسـتی بـە کارەکـەی کـرد، هـەموومان بەدیاریـەوە دادەنیشـتینو پـەرداخێك ئاومـان بـۆ دائـــەنا..تاوەکو هـــەواڵی چـــالاکیەکی پێشـــمەرگەی ئەخوێندنەوە..جا چ هەواڵێك ئەو کات هـەواڵ تـەنها چوارپێنج خـەت بـوو.. پێشـمەرگە لەفلانـە رۆژو لەفلانـە شـوێن ئـەو چالاکیەی کـردووە، یـان لوغمێـك لـەو شـوێنە تەقیـەوەو یـان پێشمەرگە لە فلانە رێگای سـەرەکی نێـوان شـارەکان خـەڵکی لەئۆتۆمبیلـەکان دابەزانـدووەو رێبـازی شـۆڕشو یـەکێتی بـۆ باسـکردوونو هـەر ئەوەندە..چـونکە ئـەو کاتـە پێشـمەرگە نەگەیشـتبووە ئـەو ئاسـتەی چـالاکی گـەورە گـەورە بکـاتو تـاوەکو لای ئێمـەش بـەدوورو درێـژی هەواڵەکـە تۆمـاربکرێو وتاری لەبارەوە بنوسرێو بڵاوبکرێتەوە. تەنها چالاکی بچووك هەبوونو بڵاودەکرانەوە.

بەوشـێوەیە ئێمـە هـەموومان هاوکـاری کـاك "فـەرهاد سـەنگاوی"یمان کـردو هانمانـدا بـۆ ئـەوەی ببێتـە بێـژەرێك لەبێـژەرەکانی رادیۆکـەمان..دوایش کـاك فـەرهاد سـەنگاوی

بەتواناو لێهاتوویی خۆی بووە ئەو بێژەرە باشەو بەدەنگە زولاڵەکەی کێوەکانی کوردستانی لەبن دەردەهێناو دڵی ناحەزانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانی ئەتۆقاندو دەلەرزاندو بوو بە دەنگی شۆڕشی نوێی کوردستان.

***چەند جارێك "فەرهاد سەنگاوی" بەم دواییانە لەراگەیاندنەکانەوە قسەی بەرزو نزمی لەبارەی تۆوە کردووە، ئایا هیچ کێشەیەکی شەخسیتان لە بەیندا هەیە؟ ئەگەر نییە هۆکاری ئەو قسانەی فەرهاد چییە؟**

–فەرهاد دەنگێکی زولاڵی هەبوو، لەئەنجامی ناکۆی لەگەڵ مامۆستا جەعفەر وای لێهات داوای لێ بکەین بێتە رادیۆ، زۆریش رێزمان گرتو دواتر بووە ئەو بێژەرەی کاریگەری لە دەیان تۆپو دەبابە زیاتر بوو.. رۆڵی لەبەرزکردنەوەی ورەی پێشمەرگەو خەڵکی کوردستان هەبوو..لەشەڕی ناوخۆشدا رۆڵی لە هاندانی هێزی پێشمەرگەی یەکێتیو رووخاندنی ورەی هێزە ناحەزەکانی یەکێتی کاریگەر بوو.

بەڵام بەداخەوە کاك فەرهاد وای لێهاتو گەیشتبووە ئەو رادەیەی دەیگوت کێشەم لەگەڵ مام جەلال هەیە..من باسی خۆم هەر ناکەم، چونکە یەکێك کێشەی لەگەڵ مام جەلال هەبووبێت، دەبێ چەند کێشەی لەگەڵ ئێمەدا هەبووبێتو چەند خۆی لە ئێمە پێ گەورەتر بووبێت! . بەڵام بەهەرحاڵ

پیاوێکی تێکۆشەر بوو بۆ سەردەمی خۆشی دەنگی فەرهاد لەچەندین تیپو کەرت کاریگەرتر بوو.

ئێمە لەراگەیاندن چەندین ساڵ بەیەکەوە بوون، لەوانەیە راوبۆچوونی جیاوازمان هەبووبێتو ناکۆکیشمان لەنێواندا هەبووبێت.. من نایەتە بیرم شتێکی وا گەورە لە نێوانماندا روویدا بێت. بەڵام بێگومان ئەو کاتیش راگەیاندن دوو کوتلەی تێدابوو، کوتلەیەکیان سەر بە مام جەلال بوو کە "من"و ژمارەیەك لە هاوڕێیان بووین، ئەویتریشیان ژێربەژێری سەر بەکاك نەوشیروان بوونو فەرهادو هەندێکی تر فەرمانیان لە کاك نەوشیروان وەردەگرتو کەوتبوونە ژێر کاریگەری ئەو.

## تیپی مۆسیقای شۆڕشو
## رۆڵی لە خەباتی شاخدا

***تیپی مۆسیقای شۆڕش، کە بەتیپی مۆسیقای شەهید کارزان ناسراوە، چۆن دروست بوو؟**

–پێشتر تیپەکە هەبوو، وەك بەشی هونەری سەر بەدەزگای راگەیاندنی یەکێتی بوو، سەرەتا کاك ئاراس ئیبراهیم تەنیا بەکەمانجەیەکەوە لەدەزگای راگەیاندن بوو، دوای دروستبوونی هەندێ کێشە، سەرلەنوێ تیپی مۆسیقامان دروستکردەوە،

کۆمەڵێك بەرهەمی زۆر گەورەو مەزنیش لەسەر دەستو ئاوازدانانەکانی "کاك دلێرو ئاراسی برایو رزگارو دلۆڤانو شوانی کەریم کابانو ئازاد خانەقینیو هیوا زەندو سەلامو...تاد" بەرهەمهاتنو ماڵیان ئاوابێت گۆرانیو سرودی زۆر بەنرخو مێژووییان لەسەر ژیانی پێشمەرگەو کوردو کوردستانو شۆڕش تۆمارکردنو شیعری یەکێك لەو گۆرانیانەش هی هەڤاڵ کوێستانیە بەناوی "ئەگەر گوڵ بای". هەر ئەوانەش دامەزرێنەرو ئەندامی چالاكو کارای تیپەکە بوون.

***ئەو کێشەیە چی بوو کە ئێوە لەگەڵ ئەو تیپەدا هەتانبوو؟ ئەوەی من بیستومە دەڵێن تۆ "دلێر ئیبراهیم"ت زیندانی کردووە! ئایا ئەمە راستە؟ هەڵویستی کاك نەوشیروان بەرامبەر بەم کارە چی بوو؟ گوایە لێپرسینەوەی لەگەڵ کردوویت.!؟**

-بەڵێ راستە..هەمیشە گوتویانە گەنگرو ماست بەوەختی خۆی..هەر شتێك ئەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ زەمانو زەمینەو سەردەمی خۆی.. لەسەرەتای هەشتاکاندا تەمەنم 32-33 ساڵ دەبوو، لێپرسراوی دەزگای راگەیاندنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بووم، ئەوسا بارەگاکەمان لەسەر سنووری کوردستانی رۆژهەلاتو لەگوندی توژەڵە بوو. دەزگای

راگەیاندن لەبەشی رادیۆو بەشی چاپەمەنیەکان و بەشی شانۆو مۆسیقا پێك هاتبوو.

رۆژێکیان مام جەلال و کاك نەوشیروان رەحمەتیان لێبێت.. بانگیان کردمو گوتیان: ئەو مارشەی یەکێتی کە شێرکۆ بێکەس شیعرەکەی بۆنووسیووە، لەژێرزەمینی ماڵێك لە سلێمانی پیاوێکی مۆسیقا ژەن بەخۆیو ماڵو منداڵیەوە ئەم مارشەی تۆمار کردووە! جا ئەبێ خوێنەر بیر لەوە بکاتەوە لەو سەردەمانەی بەعس و دامودەزگاکانی کە چەند بەهێزو تۆقێنەربوون.. کەسێك لەو سەردەم خۆیو ماڵو منداڵی ئەو سەرکێشیەیان کردبێت و مارشەکەیان تۆمارکردبێو دواتر بۆ شاخیشیان ناردبێ، ئەبێ چەند جێی رێزو تەقدیربێت! ؟

مام جەلال و کاك نەوشیروان گوتیان: باشە ئێمە تیپی مۆسیقامان هەیەو ئەوانە ئەندامی یەکێتیو کۆمەڵەن و پێشمەرگەشن، بارەگامان بۆ کردونەتەوەو هەموو مەسرەفەکیان دەدەین و ئامێرمان بۆکڕیون، ئایا هەق نییە ئەوان لێرە سەرلەنوێ مارشەکە تۆمار بکەنەوە؟.. منیش گوتم بۆ..نا. گوتیان بۆیە پێمانخۆشە تیپی مۆسیقا سەرلەنوێ ئەو مارشە تۆماربکاتەوە. من ئەو داواو راسپاردەی ئەوانم زۆر پێ لەجێی خۆی بوو..من ئەوسا گەنجێك بوومو ئەوانیش مەرجەع و رەمزی من بوون، هەرچیەکیان بڕیاردابوایە جێبەجێم

دەکرد، چونکە ئەوکات مەرکەزیەت لەناو شۆڕش‌و کۆمەڵەشدا زۆر بەهێز بوو.

منیش بەوشێوەیە چووم لەگەڵ تیپی مۆسیقا کۆبومەوەو داواکاری سکرتێری یەکێتی‌و سکرتێری کۆمەڵەم پێ ڕاگەیاندن. کاك دلێری مۆسیقاژەن‌و کاك ئاراس نارەزاییان دەربڕی‌و منیش زۆرم پێ سەیر بوو! گوتیان ئێمە شتێك ناکەین هونەرێکی نەمر نەبێت.. شتێك ناکەین بۆ حزب بێت‌و تەنها ئەو شتانە دەکەین کە نیشتیمانی‌و نەتەوەیی بن‌و بۆ کوردو کوردستان بێت. بەڵام ئەوەی تۆ دەیڵێیت تایبەتە بە کۆمەڵەو یەکێتی‌و نایکەین!.. شتێك ناکەین تەمەنی کورت بێ‌و بمرێت، شتێك دەکەین بەزیندووی بمێنێتەوە.

ئەو هەڵوێستەم زۆر لا سەیر بوو، قسەکەی کاك شێرکۆ بێکەسم بیر هاتەوە کە وەختی خۆی گلەییان لێکردبوو گوایە شیعر بۆ فلان شەهیدو فلان پێشمەرگەو.. ئەو شتانە دەنووسی. بەلای منەوە" شێرکۆ بێکەس یەکێك لەگەورەترین رەمزەکانی ئەدەبی کوردییەو شاعیرێکی مەزن‌و بەهەڵوێستی کوردبوو". شێرکۆ لەوەلامدا گوتبووی: رۆژانە دەیان پێشمەرگە لەسەنگەرەکانی بەرگری شەهید ئەبن‌و دەیان کەسی کورد لەبەردەمی سێدارەدا دروشمی سەرفرازی بۆ پێشمەرگەو شۆڕش ئەکێشن‌و شەهید ئەبن، ئەگەر لەگەڵ

شـەهید بـوونی ئەوانـدا دوو شـیعری منـیش شـەهید بـن زۆر ئاساییە ! .

منیش هەمان قسەی وەڵامی کاك شێرکۆم لەخـەیاڵ مـابوو، گوتم ئەگەر پێشمەرگە شەهید بێت، خۆ ئاوازێکی مۆسیقی یان شیعرێك لە ژیانی پێشمەرگە گەورەتر نییە. بۆیە رەفتارەکـەی ئەوانم زۆر پێ سەیر بوو، دوای گفتوگۆیـەکی زۆر نەگەیشتینە هیچ ئەنجامێك، تەلەفۆنم کردو هەردووکیانم رەوانەی مەکتـەبی عەسکەری پێشمەرگە کردو، گـوتم زینـدایان بکـەن..دواتر کـاك حەمەی حەمەباقیو چەند نوسەرێکی دیکە ئەمـەیان زانیبـوو، چووبوونە لای مـام جـەلالو کـاك نەوشـیروان..کاك نەوشـیروان نـاردی بەدوامـداو گـوتی ئـەوە چـییە.. مەسـەلەکەم بـۆ باسکرد..گوتی من هەردووکیانم ئازاد کردووە.. گـوتم جـەنابت چ ئـەمر دەکـەی هـەر ئەوەیـە. دواتـر بـۆ چارەسـەرکردنی کێشـەکە، مـام جـەلال " کـاك دلێـرو ئـاراسو بەنـدەو چـەند کەسێکی تری" بـۆ ماڵەکـەی خـۆی بـانگکردینو کۆبوونـەوەی پێکـردین. لـەوێ مناقەشـەکە کەوتـە نێـوان مـام جـەلالو کـاك دلێر، لەوێش رێك نەکەوتنو مام جەلال توڕەبوو.. کارەکە وەك خۆی مایەو ئیشەکەیان نەکرد. دواتـر کـاك دلێـر چـوو بـوو بـە پێشمەرگە لای کاك "جـەبار فـەرمان"و کـاك ئـاراس لەشـوێنی خۆی مایەوە.. ئێمەش دواتر تیپی مۆسیقاکەمان کزکـرد. کـاك دلێـر کـە چـووە لای کـاك جـەبار، شـیعرێکی بـەناوی "کـەلی قـەیوان" نووسـیو لەشـیعرەکەیدا باسی یـانزە پێشـمەرگە

دەکات کە بۆ چالاکی چوون و لەهاتنەوەیان لەسێبەری مانگەوە سەیر دەکەن دە کەسیان ماون و یەکیان شەهید بووە.. دواتریش کردی بە گۆرانیەکی سیاسی و هەر بەناوی "کەلی قەیوان" تۆماری کرد. خۆی ئەمەی کرد.. بەلام مارشی یەکێتی تۆمار نەکرد! دواجار بەهۆی کاک جەبارەوە لەگەل دلێر بووینەوە بە برادەرو زۆریش تێکەلاوبووین، ئێستاش زۆر برادەرمەو تێکەلاوی خێزانیشمان هەبووە.

35 سال دواتر لەرێگای برادەرێکی من و کاک دلێرەوە بیستم، کاتی خۆی لەشار ناکۆکی لەنێوان مامۆستا ئەنوەرقەرەداغی "ئاوازدانەرو تۆمارکەری مارشی..یەکێتی نیشتمانی کوردستان" و کاک دلێر هەبووە. بۆیە کاک دلێر ئامادەنەبوو بەرهەمی مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی تۆمار بکاتەوە.

## چاپەمەنیەکانی شۆرش و چۆنیەتی بلاوکردنەوەیان

***خۆت ئەزانی دەزگای راگەیاندن جگە لە رادیۆ، چاپەمەنیشی هەبوو لەوانە هەردوو مانگنامەی "رێبازی نوێ و شەرارە" و ناوەناوە کتێب چاپکرنیش دەبوو..ئەو ئەرکە لەسەر شانتان قورستر نەبوو لە رادیۆ؟**

–بێگومـان وایـە..کاتێك کـە بوومـە بەرپرسـی دەزگـای راگەیاندن، جاری وا هەبوو شـەو تـا بـەیانی نەدەخـەوتم، هـەر بیرم لەکارەکە دەکردەوەو چی بکـەینو چـی نەکـەین تـاوەکو ئەو دەزگایـە سـەرکەوتوو بێـتو شکسـت نـەهێنێت، دەمگـوت چۆن شتی تازە بکەین. چونکە کە کارەکـەم وەرگـرت بوومـە سەرنووسـەری مانگنامـەی "رێبـازی نوێ"ش..بـەهیچ شێوەیەکیش نەمانهێشـت، "رێبـازی نـوێو شـەڕارە" پـەکیان بکەوێت..هـەموو سـەرەمانگان لـەکاتی خـۆی دەرمـان دەکردن..جا بەهێز یان لاواز. من خۆم هیچ وتارێکم بۆ شەڕارە نەنووسیووە، بەڵام بەشی هەرە زۆری سەروتارەکانی "رێبـازی نوێ" خۆم نووسیوومن. وتارەکـانی دیکـەش هـەموو بـرادەران دەیانووسین. ئەرکەکانی دیکەی دەزگاش بێگومان بـەهاوکاری هـەموو ئـەو بردەرانـەی لـەوێ کاریـان دەکـرد بـەڕێوە دەچـوون..لێرەوە سـڵاویان بـۆ دەنێـرمو ئـەڵێم هـەموومان بەیەکەوە کاری زۆرباشمان ئەنجامدا.

***ئەی بیرۆکەی دروست بوونی "ئەنصاتی مەرکەزی" چۆن بوو؟**

–رۆژێـك برادەرانـی دەزگـای راگەیانـدن پێشـنیازیانکردو گوتیان ئێمە سەرچاوەی هەواڵمان تەنها رادیۆکانن، بـۆ شـتێك نەکەینو بڵاوکراوەیـەکی هـەواڵی چـەند لاپـەڕەیی دەربکـەینو

وەك سەرچاوەیەکی هەواڵیش بۆ هەموو برادەرانی مەکتەبی سیاسیو سەکردایەتیو سکرتاریەتی مامجەلیشی بنێرین..منیش بیرۆکەکەم پێباش بوو.. چونکە ئەو کاتە نەماندەتوانی شتی گەورە دەربکەین..مەبەستمە بڵێم ئەو "ئەنصات مەرکەزیەی" ئێستا دەردەچێتو زۆریش نایابە، بیرۆکەکەیو دەرچوونەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1981-1982و ئەوسا بەهەوڵو تەقەلای بردەرانو دەزگای راگەیاندن دەرمان دەکردو رۆژانەش بەسەر بارەگاکاندا دابەشمان دەکرد..برادەرانیش زۆر بەرێزەوە سەیری ئەو هەوڵەیان کردو گوتیان کارێکی زۆر باشتان کردووە.

## *ئایا هەر بەناوی ئەنصات مەرکەزیش بوو؟

-راستی ئەو هەواڵنامەیەی ئێمە دەرمانکرد، سەرەتا لەسەر پێشنیاری برادەرانی دەزگای راگەیاندن بوو لەوان هوشیار عابدو ئەردەلانی هونەرمەندو کاروانی برایو سەعدون فەیلیو هەندێ کادیری دیکەش.. ئەو کات وەك هەواڵنامەیەك بوو..ناوی"ئەنصاتی مەرکەزی" نەبوو..راستیەکەی بیرم نەماوە ناوەکەی چی بوو..بەڵام وەك ئەنصاتی ئێستا وابوو.. هەواڵو زانیاریمان تێدا بڵاودەکردنەوە.. بەتایپێك چاپ دەکراو دواتر بە رۆنیۆ رادەکێشراو تەنها چل پەنجا دانەیەکی لێ بڵاودەکرایەوەو زۆریش باش نەبوو.. هەموو بەیانیەکیش بۆ

سەرکردایەتیمان دەنارد..جارێکیان بیرۆکەی ئەوەش هاتە پێشەوە کە زیاتر رابکێشرێتو لەبازاڕەکەی قاسمەڕەشو ناوزەنگ بفرۆشرێت، تاوەکو پارەیەك بۆ کارەکە پەیدا بکات، بەڵام دواتر ئەمەش نەکراو ناوچەکەمان جێهێشت.

## دروستکردنی رێکخراوی یەکێتی نوسەرانی کوردستان لەشاخ

*** 1980 یەکێتی بیری لە دامەزراندنی یەکێتی نوسەرانی کوردستان کردەوە، لەو هەوڵدەدا چیتان بیرماوەو کێبوون ئەوانەی کە بەشداربوونو کاریگەری بەسەر بواری رۆشنبیریو کەلتووری شۆڕشدا چی بوو؟**

–لە بارەی دامەزراندنی یەکێتی نوسەرانی کورد، لەراستیدا من رۆڵی سەرەکیم تێیدا نەبووە، چونکە من زیاتر بە کاروباری راگەیاندنو کاری سیاسی سەرقاڵبووم. بەڵام ئەوەی دێتە بیرم "کاك حەمەی حەمە باقی، ئەبوبەکر خۆشناوی رەحمەتیو ناسر حەفید"نالە"و هەڤاڵ کوێستانی" رۆڵی سەرەکیان هەبوو. لەگەڵ کۆمەڵێك نوسەری دیکەی ناو پارتیو شیوعیو سۆسیالیست..بەراستی ناوی ئەوانم بیر نییە.

ئەوسا هێشتا نێوانی حزبەکان تێك نەچووبوو، هەم پێشمەرگەو هەمیش نوسەرو هونەرمەندان هاموشۆی یەکتریان دەکرد، ئەو کۆمەڵە نوسەرو ئەدیبەش لەنێوان خۆیاندا راوێژیان کردو لەگەڵ نوسەرو ئەدیبانی هەموو لایەنەکان دادەنیشتن، دواتر بیرۆکەی "یەکێتی نوسەرانی کوردستان" دروست بوو. یەکێك لە هۆکارەکانیشیان ئەوە بوو، ئەو نووسەرانە نەیاندەزانی لەکوێ نوسینو بەرهەمەکانیان بڵاوبکەنەوە..مانگنامەو گۆڤارە سیاسیەکانیش جێی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ئەوانی تێدا نەدەبوەوە، یان بەشی هەموویانی نەدەکرد.. بۆیە ئەو کۆمەڵە نوسەرو ئەدیبە بەهۆی راگەیاندنو بڵاوکردنەوەی بەرهەمو دەنگی خۆیان پشتیوانیان لە هێزی پێشمەرگەو لە شۆڕشکردو ئەو رێکخراوەیان پێك هێنا. بەڵام من لەکاتی دامەزراندنەکەیو راگەیاندنەکەیەوە وەك دۆستێکی ئەوانو دۆستی ئەدەب هاوکارو بەشداریان بووم..ئەگەر بشگەڕێنەوە بۆ گۆڤاری "پێرو" وابزانم یەکەم گۆڤاری نوسەران بوو، زیاتر لەوە تێ دەگەن کە کێ بەشدارو دامەزێنەری بووە..چونکە من تەنها ئەو ناوانەم بیرمابوو کە باسم کردن.

***رۆڵی مام جەلال لە دامەزراندنو گرنگیدان بەو رێکخراوە چی بوو ؟**

–بێگومان مام جەلال هەمیشە دۆستی ئەدەبو هونەر بوو، دروشمێکی هەبوو دەیگوت"ژیانو ئازادی بۆ ئەدیبو نوسەرو هونەرمەندان"و پاڵپشتیان بوو، داواکاریو پێداویستیەکانی بۆ جێبەجێی دەکردن. چونکە دەیگوت شۆڕش راستە ئەرکە سەرەکیەکەی سیاسیەتو هێزی چەکدارە، بەلام ئەدەبو هونەر پاڵپشتیو سەنگەرێکی ترە لە سەنگەرەکانی بەرەنگاری.. بەتایبەت ئەوسا ئەدەبو هونەری بەرەنگاری زۆر باو بوو. بۆیە مامجەلال هەموو کار ئاسانیەکی بۆ دەکردن.

***وەك دەزانین یەکێتی نووسەران و ئەندامەکانیان زۆر بەرهەمیان لەشاخ بلاوکردونەتەوە، بەتایبەت گۆڤارو کتێبەکانیان، ئەمەیان چۆنو لەکێ چاپدەکران؟**

–ئەو رێکخراوە بۆ چاپکردنی گۆڤارەکەیان وا رێك کەوتبوون، هەر جارەی لە لای یەکێك لە حزبەکان چاپبکرێت، چونکە هیچ حزبێك لەرووی چاپو ئیمکانیەتو کاتی چاپکردنەوە بەتەنیا دەرەقەتی نەدەهاتن. بۆیە بەو شێوەیە گۆڤارەکەیان چاپ دەکرد. ئەوساش هەموو حزبەکان کارئاسانیان دەکردو یارمەتی ئەدیبو نوسەرو هونەرمەدانیان دەدا تاوەکو ئازادانە سەردانی یەکتر بکەنو شتەکانیان لە گۆڤارەکە بلاوبکەنەوە.

***ئایا یەکێتی توانای ئەوەی نەبوو چاپخانەو پێداویستیان بۆ دابین بکات؟**

-راستە، دواتر وای لێهات چاپخانەیەکی تایبەتیان بەناوی شەهید"جەعفەر عبدولواحید" بۆ دامەزراندن..رۆنیۆو تایپ و کارمەندو بارەگایەکی تایبەتیان بۆ ئەدیب و نوسەران دابینکردو هەموو پێداویستی ژیانیان بۆ جێبەجێ کرا.

سەرکردایەتی یەکێتیش بەهیچ شێوەیەك کاریگەری بەسەریانەوە نەبوو، دەستیشی لەکارەکانیان وەرنەدەدا..تەنها پشتیوانیان بوو.. ئەمەش بێگومان هەر بە هەوڵی مامجەلال کرا.

***ئایا ئازادی رادەربڕین لەشاخ بەوشێوەیە بەرتەسك بوو، تا ئەو هەموو گوشارە لەسەر نووسینی"سەگوەڕ" بخەنە سەر رۆمانووس "محەمەد موکری" ئەوەی تۆ دەیزانی ئەمە چۆن بوو؟**

-ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە، خولێخۆشبوو "محەمەد موکری" هەم نووسەر بوو، هەمیش پێشمەرگە بوو، "محەمەد موکری" بەرگەی ئەو زەبرو زەنگەی نەگرتبوو کە لەشار لەسەر هونەرمەندو ئەدیب و نوسەران بوو، بۆیە هاتبووە شاخ..یەکێك لەبەرهەمەکانی خۆی نووسی و بڵاوکرایەوە ئەویش رۆمانی "سەگوەڕ"بوو.

کاتێك کە "سەگوەڕ"ی نووسی لە سەردەمێکدا بوو، دەبوو ئــەدەبو نووســینو هونــەر پشــتیوانی شــۆڕش بــنو دژی حکومــەتی بەعســی عێراقــی بــنو پشــتیوانی لەپێشــمەرگەو خــەباتو شــەهید بکــاتو لــەپێناو بەرزکردنــەوەی مــۆڕاڵی پێشــمەرگەو پــیرۆزی شــەهید دابێــت. ئێمــە پێمــانوابوو دەبــێ ئەدەبو هونەرمولتەزیم بێتو لەخزمەت میللـەتو لەگـەڵ دۆزە رەواکەیدا بێت..نەك ئەدەب تەنها بۆ ئەدەب بنوسرێت. بـەڵام "محەمــەد مــوکردی" رۆمــانی "ســەگوەڕ"ی بڵاوکــردەوە، لەراســتیدا پێچــەوانەی رای ئێمــە بــوو، مەبەستیشــم لــە ئێمــە بەشێك لە کادیرە سیاسیو سەربازییەکانە.. بۆیە نارحەتیەکی زۆری لێ پەیدا بـوو. خـەڵك جنێویـان پــێ دەداو هەڕەشـەیان لێـدەکرد.. هــەتا منــیش شــتێکم لــە گۆڤــاری "گــزنگ" لــەو بارەیەوە لەسەر"موکری" بڵاوکـردەوە، گۆڤـاری "گـزنگ" لـە دوای "پێرو" دەردەچوو. لـە راسـتیدا تـەنگیان بـە "محەمـەد موکری" هەڵچنیبوو. دواتـر خەبەرەکـە گەیشـتە مـام جـەلال.. رۆژێــك مــام جــەلال منــی وەك بەرپرســی دەزگــای راگەیانــدن بانگکرد..گوتی ئەوە چییە ئەو غەڵبە غەڵبە لەسـەر "محەمـەد مــوکری" دروســت بــووە. گــوتم وەڵا مــام جــەلال "مــوکری" کــارێکی خراپــی کــردووە.. شــتێکی لەســەر شــۆڕشو ئــەدیبو نوســەران نووســیووەو هــەموویانی بــە ســەگوەڕ لەقەڵــەم داون. لەبــەر ئــەوە کــادیرو پێشــمەرگە زۆر نارحــەتبوونو دەترســم

کاردانەوەی خراپیان بەرامبەر هەبێت. گوتی گوێبگرە..هەر کەسێك دەست بۆ "محەمەد موکری" درێژ بکات پەنجەی دەبڕمەوە.."محەمەد موکری" چیکردووە، تۆپی پێوەناون؟ فڕۆکەی هێناوەتەسەرتان؟ تەقەی لێکردوون؟ لێی داون؟

"محەمەد موکری" شتێکی بەقەڵەمەکەی خۆی نووسیووەو گوزارشتی لەرای خۆی کردووە، ئێوەش بە قەڵەم جوابی بدەنەوەو تەواو.

گوتی ئێمە لەو شاخانە کە داوای مافی کوردو دیموکراسیو ئازادی دەکەینو دەمانەوێ حکومەتی دیموکراتی لەعێراق دابمەزرێنینو کوردو کوردستان ئازادبێت..ئا بەم شێوەیە لەناو شۆڕش هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵك دەکەن. ئەگەر ئێمە لەناو شۆڕش رێگا بەنوسەرو ئەدیبو هونەرمەندان نەدەین رای خۆیان دەرببڕن، ئەی ئێمە چۆن ئەو داوا سیاسیە گەورانەمان جێبەجێ دەبن..ئێمە خۆمان داوای ئازادیو دیموکراسی دەکەین. ئایا دەبێ خۆشمان ئازادیو دیموکراسی نەپارێزینو رێگری لەرای خەڵك بکەین؟

گوتی بۆیە بەتۆش رادەگەینم..هەر کاردانەوەیەك لەبەرامبەر "محەمەد موکری"بکرێت بەرپرسیاری یەکەم تۆی! . داواشت لێدەکەم تەواوی کادیرە عەسکەریو سیاسیەکانم بۆ کۆبکەیتەوە قسەیان بۆ دەکەم.

رۆژێك هەموویانم بۆ مام جەلال کۆکردنەوەو ئیتر مام جەلال قسەی بۆکردن‌و هێمنی کردنەوەو "محەمەد موکری"یش ئارام بوەوە.."موکری"یشی بانگ کردو دڵنەوایی کردو پێی گوت هیچ کەس ناتوانی پێت بڵێ "لەپشتی چاوت دوو برۆ"یە.

مەبەستم لەو شاخانەش هەروا بوو، کاتێك هاتینەوە شاریش مام جەلال پیاوێکی دیموکرات‌و پشتیوانی ئازادیی‌و رادەربڕین بوو.

***بیستومە لەسەر داکۆکی کردنت لە نووسەران، جارکێکیان دەستت لەکارکێشاوەتەوە؟ ئەم رووداوە چۆن بوو؟**

–راستی من بەحوکمی راگەیاندن‌و برادەرایەتیشم سەردانی ئەو نووسەرانەم دەکرد، چونکە ئەوانیش لەناوزەنگ‌و توژەڵە بوون، ئەوان بارەگاکەیان لەقەدپاڵی شاخەکە لە نزیك بارەگای حزبی شیوعی بوو، نزیك ماڵی مام جەلال‌و کاك نەوشیروانیش بوو، زۆرجار سەردانم کردوون، لەگەڵیان دادەنیشتم‌و گفتوگۆ لەنێوانماندا دەکرا..چەند جارێك کە دەچوومە لایان دیاربوو نیگەران بوون‌و دەیانگوت پێداویستیەکانی ژیانمان وەکو پێویست باش نییە، ئەوەی من دەیڵێم لەساڵی 1980–1981 بوو، هێشتا دەرفەت نەبوو، هەموو شتەکانیان بۆ دابین نەکرابوون. ئەوان داواکاریی‌و نیگەرانی خۆیان دەربڕیی‌و گوتیان نازانین چۆن داواکانمان بگەیەنینە سەرکردایەتی‌و مەکتەبی سیاسی. بۆیە دەمانەوێ لەڕێگای تۆوە بیگەیەنین. منیش

راکانی ئەوانم لەگەڵ برای گەورەم کاك ملازم عومەر باسکردن.. چونکە ملازم عومەر هەم پیاوێکی بەرێزو خۆشەویست بوو، هەمیش دۆستی نوسەرو ئەدیبان بوو، زۆریش لەگەڵیان تێکەڵبوو، لەلایەکی دیکشەوە دۆستێکی نزیکی کاك نەوشیروان بوو.. رای خۆشم لەگەڵ باسکرد..ئەوسا کاك ملازم عومەر ئەندامی مەکتەبی سیاسیو ئەندامی ناوەندی کۆمەڵەش بوو. کاك ملازم عومەریش مەسەلەکەی لەگەڵ کاك نەوشیروان باسکردبوو.

دواتر مەوعیدێکی کۆبوونەوەیان داناو بەدوای منیشیاندا نارد، کاتێك چووم کاك نەوشیروانو کاك ملازم عومەرو یەك دوو برادەری دیکەی ناوەندی کۆمەڵەش لەوێ بوون..راستی ناوەکانیانم بیر نەماوە کێ بوون. لە کاتی گفتوگۆکردنمان لەگەڵ کاك نەوشیروان باسی بارودۆخی نوسەرو ئەدیبانم بۆ کردو رای خۆشم دەربڕیو گوتم دەبێ بەپێی رێنماییەکانی مام جەلال ئەدیبو نوسەرو هونەرمەندان ژیانیان بۆ دابین بکرێو پێداویستیان مسۆگەربکرێتو بێحاڵ نەبن.. بەلأم ئێستا ئەوان گلەییان هەیە. کاك نەوشیروان بەدەنگ هاتو گوتی ئەوە رای خۆتە ! بەلأم ڕایەکی هەڵەیە..گوتم بەڵێ رای خۆمە..گوتی ئەوە ڕای پیاوێکی دواکەوتووی شارێکی دواکەوتووشە..منیش گوتم ئاساییە من خۆمو راکەشم دواکەتوو بێت، بەلأم شارەکەم بۆ دواکەتوو بێت..هەولێر شارێکی دێرینەو مێژووی خۆی

لەرووی ئاوەدانیو کەلتووریو ئەدەبو هونەر هەیەو دەیان خەڵکی سیاسیو هونەرمەندو ئەدیبو نوسەری گەورەی هەن.

بە هەرحاڵ کاک نەوشیروان قسەی توندی کردنو منی نیگەران کرد! لەبەرامبەریدا بێ دەسەڵات بووم، هەر ئەوەم پێکرا هەستام ڕۆیشتم..بەڵام کاتێک هەستام دوو فرمێسک بەچاومدا هاتنە خوارەوە..چونکە هەستم کرد کاک نەوشیروان بەهۆی دەسەڵاتو هێزی خۆیەوە غەدرم لێدەکات، نەشمدەتوانی ئەوسا بەرگری لەخۆم بکەم. چونکە ئەو سکرتێری کۆمەڵەو ئەندامی مەکتەبی سیاسیو جێگری مام جەلال بوو. منیش کادیرێکی سادەبووم، بەڵام بەرپرسی ناوەندی ڕاگەیاندن بووم.

کاک ملازم عومەر بەدوامدا هاتو باوەشی تێکردم، بەڵام نەگەڕامەوە. بەلای بارەگای مام جەلالیشدا ڕۆیشتم..پێشمەرگەکان گوتیان مام جەلال کاری پێتەو تۆی دەوێ. وەڵامی ئەوانیشم نەدایەوەو ڕۆیشتمەوە تۆژەڵە. نێوانی تۆژەڵەو ناوزەنگ چل خولەك، نیو سعاتێك دەبوو. ئیتر نامەیەکی دەست لەکارکێشانەوەم بۆ مام جەلال نوسیو گوتم ناتوانم چیتر ئەو شوێنە بەرێوە ببەمو شەڕی کاک نەوشیروانیشم پێناکرێت. بۆیە باشتر وایە واز بێنم. بۆ بەیانیەکەی مام جەلال تەلەفۆنی بۆ کردم..گوتی نیوەڕۆ وەرە لای من بەیەکەوە نان دەخۆین. لەڕاستیدا کاک یوسف

زۆرزانیش زۆر قسەی لەگەڵ کردمو گوتی ئەوە سیاسەتەو ئەبێ بەرگەی بگری، ئەو وەك مامۆستاو پشتیوانێکم بوو.

کاتێك نیوەڕۆ چوومە لای مام جەلال.. هەموو شتێکی بۆ باسکردمو گوتی بڕۆ دەست لەکارکێشانەوەش نییە..بچۆ سەر ئیشی خۆتو کارەکانی خۆت جێبەجێ بکە.

*** لە بارەی نامیلکەکەی "حەمە سەعید حەسەن" کە لەسەر چەند نوسەرو ئەدیبێکی سلێمانی نووسیبوو، دەڵێن کاك نەوشیروان لێت توڕە بووە؟ هۆکاری توڕە بوونەکەی چی بوو؟**

–راستە، ئێمە لەترسی تۆبارانی ئێران رامانکردبوو، بارەگاکانمان لە "سەرشیو" دانابوون، رۆژێکیان کاك نەوشیروان لەرێگەی بێتەلەوە پەیوەندی پێوەکردمو گوتی کاك حەمەسەعید حەسەن کەسێکی نوسەرو رۆشنبیرەو دێتە لات نامیلکەیەکی هەیە بۆی چاپ بکەن.

کاك حەسەعید حەسەن هاتو ماوەیەك لەلای ئێمە لەکەرتی ئێزگە مایەوە..ئەو ماوەیەی لامان بوو راستیەکەی زۆر کوڕێکی بەرێزو رێك پێكو رۆشنبیرو شاعیرو نوسەر بوو، تا نامیلکەکەشمان بۆ چاپ کرد لەوێ بوو. کاتێك نامیلکەکە چاپ بوو، پاش ماوەیەك کاك نەوشیروانم بینیەوە، زۆر

بەنارحەتیەوە دیسان گوتی: تۆ کاری خۆت ناکەی، بۆ شتەکان ناخوێنەوە؟

گوتم: چی بووە، چ کارێك هەبووە نەمکردبێت؟

–گوتی ئەم نامیلکەیەت بۆ حەمەسەعید حەسەن چاپکردوەو نەتخوێندۆتەوە تا بزانی چی تێدایە؟

–گوتم کاك نەوشیروان، نە حەمەسەعید حەسەن دەناسم، نە نامیلەکەشم دیوە، تۆ خۆت پێت گوتووم بۆی چاپ بکەن..

–گوتی دەبوایە بیخوێنیەوە.!

–گوتم کاك نەوشیروان کە تۆ بڕیاری چاپکردنی شتێك بدەی، من چی بخوێنمەوە.

–دیارە ئەو مەسەلەیە بۆ سەردەمی حکومەتی عێراق دەگەڕێتەوە ئەو کات هەندێ لە نوسەران ویستبوویان یەکێتی نوسەرانی کورد بکەنە لقێك لە یەکێتی نوسەران عێراق..ئەمەش ببووە هۆی دروستبوونی ناکۆکی لەنێوان ئەدیبانی سلێمانی..ژمارەیەك لەوانە نازانم "کاك شێرکۆ بێکەسو کاك رەئوف بێگەردو چەندێکی دیکە" چووبوونە ئەو کۆنگرەیەی نوسەرانی عێراق..بیرم نەماوە لە کۆنگرەکە رازی ببوون یەکێتی نوسەران کورد ببێتە لقێك لە نوسەرانی عێراق ..یان نا.

هەندێك لەنوسەرانی دیکەش دژی ئەو رایە بوون، یەکێك لەوانەش کاك حەمەسەعید حەسەن بوو، بۆیە ئەو نامیلکەیەی لەدژی ئەوانی تر نوسیبوو.

دواتر کاك نەوشیروان نامیلکەیەکی دیکەی بۆ ناردمو خۆشی پێشەکی بۆ نوسیبوو، نامیلکەکە هی کاك شێرکۆ بێکەسو ئەوانی دیکە بوو، ئەویشمان چاپکرد، نامیلکەکە لە وەڵامی نامیلکەکەی کاك حەمەسەعید حەسەن بوو. پێشموابێت لەو ساوە پەیوەندی کاك نەوشیروانو کاك حەسەعید حەسەنو ئەوانی دیکە تێك چوو.. چونکە کاك نەوشیروان بەلای کاك شێرکۆو کاك رەئوفو برادەرەکانی ئەوانی شکاندبووەوە.

***کاتی خۆی کتێبێك لەبارەی ئێزیدییەکانەوە لەلایەن"سەربەست حوسێن"ەوە نوسرابوو..گوایە تۆ لەسەر ئەم کتێبە کێشەت لەگەڵ کاك نەوشیروان لێ دروست بووە..بۆچی؟**

-لە کاتی دانوستانی نێوان یەکێتی نیشتیمانی کوردستانو حکومەتی عێراق لە ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی رابردوو، رۆژێکیان کاك نەوشروان تەلەفۆنی بۆ کردمو گوتی پێویستە کەسێکی عاقڵ بدۆزیەوە تاوەکو زنجیرە وتارێك لەبارەی ئێزیدییەکان لەڕووی ئینتیمای نەتەوەییان بۆ نەتەوەی کورد

بنوسیۆ باس لە غەدری مێژوویی بکات.. چونکە ئێمە لە دانوستانەکانماندا دەمانەویێ دۆزی ئێزیدییەکان باس بکەین.. منیش کوڕێکم دەناسیێ ئەندازیار بوو.. نوسەریش بوو..کەسێکی عاقڵو بەتوانا بوو، خەڵکی قەلادزێ بوو، ناوی "سەربەست حوسێن" بوو. ناردمە لای کاک نەوشیروان. مام جەلالو کاک نەوشیروان لەگەڵی دانیشتبوونو کۆمەڵێك ڕێنمایی‌و ڕاسپاردەو بۆچوونیان پێدابوو. من ئێستاش نازانم چیان لەگەڵ باسکردبوو، بەڵام سەربەست گوتی هەردووکیان کۆمەڵی تێبینی‌و بەرچاو ڕوونیان پێداوم. بۆیە کاک سەربەست هەفتەی دووسێ وتاری لەبارەی یەزیدییەکان دەنوسینو ئێمەش لە ڕادیۆ بۆمان بڵاودەکردنەوە.

ڕاستیەکەی من بەلای وتارەکاندا نەدەڕۆیشتم، پێموابوو مادام مام جەلالو کاک نەوشیروان ڕێنماییان کردووە، پێویستی بە من نییە چاوم لەسەری بێتو وتارەکان بخوێنمەوە، چونکە ئەوان لەمن زیرەکترو سیاسیترو زاناتربوونو بەرپرسی منیش بوون..جگە لەوەی ئەوسا گەورەیی‌و بچووکی هەبوو.

دوای تەواوبوونی زنجیرە وتارەکە، سەربەست داوای کرد وتارەکانی بۆ بکەین بە نامیلکەیەكو ئێمەش بۆمان کرد. هێشتا دانوستانەکە تێك نەچووبوو، ڕۆژێك لە کۆبوونەوەی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە "ئاوەژێ"ی بنگرد کە ماڵی کاک نەوشیروانی لیێ بوو، کاک نەوشیروان لە کۆبوونەوەکەدا لەبەر چاوی سەرکردایەتی بەگژمدا هاتەوەو

گوتی ئەوە تۆ بۆ شتەکان ناخوێنیتەوەو کارەکانت بە باشی ناکەی؟ منیش پێم سەیر بوو، گوتم بۆ چی بووە.. گوتی ئەو نامیلکەیەی بەناوی ئێزیدییەکان بڵاوبۆتەوە بۆچی شتی خراپی تێدایە، من حەپەسامو گوتم کاکە من نەئاگام لەو رێنماییانە هەیە کە ئێوە بە "سەربەست"تان داوەو نە ئاگام لێیە چۆن نوسراوە.. تۆو مام جەلال رێنمایتان پێداوەو لەسەر بنەمای ئەوەوە هەموو رۆژێك لە رادیۆ وتارەکان بڵاوبوونەتەوەو ئەوجا چاپکراوە. گوتی نا تۆ ئاگات لە ئیشو کارەکانت نییەو شتی خراپی تێدایە..

من زۆر نارحەت بووم، دوای کۆبوونەوەکە بەتەنها چوومەوە لای‌و گوتم تۆ حەق نییە لەبەر چاوی ئەو هەموو برادەرانە بەگژمدابێیتو بتەوێ بمشکێنی..تۆ برای گەورەی منیو بەرپرسمی، دەتوانی بەتەنها بانگم بکەی‌و لێشم بدەی دەنگ ناکەم..گوتی برۆ هەر ئەوەیە.. زۆر بە تەوسەوەو بێ هیچ دڵنەوایی‌و موجامەلەیەك وای گوتو منیش ئەوێم بەجێهێشتو رۆیشتم..ئەو رەفتارو قسە رەقانەی کاك نەوشیروان بوون بەهۆی ئەوەی رۆژ لەدوای رۆژ لەیەکتر دووربکەوینەوە.

***

# دانوستانی ساڵی 1983ی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەگەڵ حکومەتی عێراق

***کەی دانوستانی نێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستانو حکومەتی عێراق دەستی پێکرد؟ بۆچی دواجار شکستی هێنا؟**

-دیارە دانوستانەکان لەرێگای دکتۆر عەبدولڕەحمانی قاسملووەوە بوونو لەکۆتایی ساڵی 1983 دەستیان پێکرد، رۆژێك د.قاسملو بە کۆپتەرێکەوە هاتە بارەگای مام جەلال کە ئەو کات لە گوندی "زیخان"ی دۆڵی بالیسانی خۆشناوەتی بوو، لە یەکێك لە دیوەخانەکانی شێخانی ئەو ناوچەیە بارەگای دانابوو، شوێنەکەی دەکەوتە خوارووی گوندی بالیسان. ئەو کات هەموو سەرکردایەتی بۆ کۆبوونەوەی دەوری ساڵانەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە بالیسان بوون. وەفدێکی گەورە بە سەرۆکایەتی مام جەلال چوونە بەغدا، باقی برادەرانی تریش گەڕانەوە بۆ سەر کاری خۆیان. تەنیا کاك نەوشیروان لەدۆڵی بالیسان مایەوە. منیش بۆ جێبەجێکردنی هەندێ ئیشوکاری نێوەندی شار چەند رۆژێك لەوێ مامەوە.

شاندەکە ماوەی سێ ڕۆژیان پێچوو بوو هیچ دەنگ‌و باسێکیان نەبوو، ڕۆژێك كاك نەوشیروان بەدوایدا ناردم.. گوتی ئەرسەلان ئەو برادەرانە جیهازیان پێیەو هیچ دەنگیشیان نییە، دەترسم هەموویان سەرنگۆم کردبن..چی بکەین؟ منیش گوتم جا کاك نەوشیروان هیچمان پێدەکرێت! هەر دەبێ چاوەڕێ بکەین. دواتر پاش دوو ڕۆژێك جیهازەکەیان خستبووەگەڕ، چونکە سەرەتا ڕێگایان پێنەدابوون بەگەڕی بخەن. ئەوسا خەبەریان داینەوەو گوتیان سەلامەتین‌و خەریکی دانوستانین.

بەهۆی مفاوەزاتەوە بارەگاو هەموو دەزگاکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان چوونەوە نزیك سەرجادەو شارەکان‌و بارەگای مەکتەبی سیاسیش چووە سووورداش، بەلآم بارەگای دەزگای ڕاگەیاندن هەر لەبەرگەلۆ مایەوەو دەبوایە ڕادیۆکەش کاربکات‌و لەبەر دانوستانیش نابوو هیچ شتێك لەبارەی حکومەت بلێت.. ئێمەش هەر گۆرانی‌و مۆسیقاو سرودی نیشتیمانی‌و مێژووی کوردو بەرنامەی ئەدەبو هونەرمان پەخش دەکرد. دواتر کە نەگەیشتینە هیچ ئەنجامێك لە دانوستانەکاندا ڕادیۆکەمان وەکو پێشان لێکردەوە.

ئەو ماوەیەی دانوستانەکە بەردەوام بوو، ئێمەش چەندجارێك هاتینەوە ناو شارەکان‌و هەندێ پێداویستیمان بۆ چاپخانەو ڕادیۆ دەبرد، وەك مەرەکەبو وەرقەو ئامێری

پێویستی دیکە.. چونکە مەترسی ئەوەمان هەر هەبوو کە لەوانەیە لەگەڵ حکومەتی عێراق نەگەینە ئەنجام.

جارجارە دەچووینە سورداش.. ئەوسا رێگای سەیارە نەبوو دەبوایە بەپێیان لەبەرگەڵوەوە بچینە گوندی شەدەڵەو ئەو بەینەش سعاتو نیوێکی پێدەچوو، دواتر ئەگەر لەوێ بۆ سورداش سەیارەیەکمان دەستکەوتبا ئەوە شتێکی گرنگ بوو. چونکە سەیارە هاتوچۆی گوندی شەدەڵەیان دەکرد.

لە گوندی شەدەڵە بارەگای فەوجێکی سوپای عێراقی لێبوو، رۆژێکیان دوای تەواو بوونی کۆبوونەوەکان لەگەڵ یوسف زۆزانی لەسورداشەوە دەهاتینەوە بۆ بەرگەڵو، کاك یوسف گوتی بۆ سەرێك لەو ئامر فەوجەی ئێرە نەدەین، نەوەك رۆژێك کارمان پێی بکەوێت..چووین خەبەرمان پێداو گوتمان پێی بڵێن بەرپرسی دەزگای راگەیاندنی یەکێتیو ئەندامی سەرکردایەتی هاتووەو دەیەوی سەردانت بکات.. وەڵلا ئامر فەوجەکە کە ناوی "عەقید محەمەد"بوو زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردینو ئێمەی بردە ژوورەکەی خۆی داینایین..لەکاتی قسەکردندا دیارە عەرەبیەکەی من تۆزی دەکرد، بەلاّم عەربیەکەی کاك یوسف زۆزانی فول بوو.. ئەفسەرەکە لە یوسفی پرسی گوتی تۆ پێشتر چ کارەبووی.. ئەویش گوتی خوێندکاری زانکۆ بووم لە یوگسلاڤیاو کوردی سوریامو لەپێناو شۆرش وازم لەخوێندن هێناوەو هاتومەتە

ئێرە.. لەمنی پرسی ئەی تۆ چیت خوێندووە، گوتم دەرچووی زانکۆم..کەوا مگوت لە ئەژنۆی خۆیداو گوتی دەرچووی زانکۆی! ! منیش گوتم بەڵێ، بۆ تۆ پێت وایە ئەوانەی لەو شاخۆ کێوانەن هەموویان نەخوێندەوارو شوانو گاوانن..گوتم دەیانو سەدان ئەندازیارو دکتۆرو مامۆستاو پارێزەری تێدانو شەهیدەکانیشمان هەر خاوەن شەهادەو خوێندەوار بوون.

گوتی..پێشتر فەرمانبەر بووی..گوتم بەڵێ. گوتی چەند ساڵە پێشمەرگەی.. گوتم ساڵی 1973 خوێندنی زانکۆم تەواو کردووەو چوارساڵ زیندانی بوومو لەساڵی 1979شەوە پەیوەندیم بەشۆڕشەوە کردووە.. گوتی ئەزانی موچەی ئەو چەند ساڵەت چەند دەکات.. گوتم بەڵێ چۆن نازانم..بەس پارە لای ئێمە گرنگ نییە، مافەکانی نەتەوەی کورد لامان گرنگن. کابرا زۆری پێ سەیربوو..بەهەرحاڵ بەرێزەوە بەرێیکردینو بە سەیارەیەکی خۆیان تا نزیك شاخەکەو تا رێگا هەبوو گەیاندینیو دواتر ئێمە بەپێ چووینەوە.

***ئایا گفتوگۆی شۆڕش لەگەڵ حکومەتی عێراق لەساڵی 1983، تەنها لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی بوو یان حزبەکانی دیکەش لەنێو گفتوگۆکەدا بوون؟**

–نەخێر، گفتوگۆی نێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستانو حکومەتی عێراق لەساڵی 1983 کە لەرێگەی "د.قاسملو"ی

شەهید پەیوەندییەکە دروستکرابوو.. سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ دوای ئەو شەڕەی هێزی پاسداران کە پەلاماری حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی رۆژهەڵاتیداو تووشی شکستی کردن و ئێمەش بەهۆی پشتیوانیی و بەشداریمان لە کوردانی رۆژهەلات بەر ئەو شالآوە کەوتین، دواتر دانوستان بووە ئەمری واقیع، چونکە پێشمەرگەو هێزەکانی یەکێتی زۆر ماندوو ببوون و پێویستیەکانمان کەم ببوون و شۆڕش پێویستی بە پشوودانێك هەبوو.. بەڵام دانوستانەکە تەنها لەگەڵ یەکێتی بوو.

***مام جەلال دەڵێت: نامەی پێشنیاری گفتوگۆ کە لەلایەن "د.عەبدولرەحمانی قاسملو"وە نوسرابوو، بۆ من و عەزیز محەمەد هاتبوو، ئایا حزبی شیوعی کوردستان بەشداری لە دانوستانەکاندا هەبوو؟** ....."دیداری تەمەن. ل. 147.ب.2"

–نا، نەخێر، هیچ پەیوەندییەکی بە مامۆستا عەزیز محەمەدو حزبی شیوعیەوە نەبوو، چونکە ئەو کاتە ئێران لەلایەك و بەرەی جود کە"پارتی و حزبی شیوعی و سۆسیالیست"بوون، لەلایەك و حکومەتی عێراقیش لەلایەك، هەر هەموویان هێرشیان بۆسەر یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بوو.

***یەکێك لە کۆبوونەوە جەماوەرییەکانی خەڵکی کوردستان لەسەردەمی دانوستاندا ئاهەنگی نەوروز بوو، چۆن رێکخراو مەبەستی شۆڕش لەمە چی بوو؟**

- لە نەورۆزی ساڵی 1984، بڕیاردرا ئاهانگی نەورۆز لە دەشتەکەی سورداش بکریێو من بووم بە بەرپرسی ئامادەکاریو ڕێکخستنی ئاهەنگەکەو کاك جەبار فەرمانیش بوو بەئەندام، چونکە ئەو کات من سەرکردایەتی بووم، بەلاّم کاك جەبار سەرکردایەتی نەبوو بەڵکو بەرپرسی ڕێکخراوی کۆمەڵەبوو لەو ناوچەیە. کاك جەبار پیاوێکی زۆر کاراو دەستپڕو چەلەنگ بوو، زۆر هەڵسوڕاو بوو بۆ هەر کارێك پێت گوتبایە ئامادەبوو.. توانیمان ئاهەنگێکی زۆر گەورە لەوێ ساز بکەین..

سەرەتا بەشۆڤڵ شانۆیەکمان دروستکردو دواتر لە رادیۆ بانگەوازی ئاهەنگەکەمان بلاّوکردەوەو رامانگەیاند کە لە دەشتی سورداش ئاهەنگەکە دەکرێتو بە خەڵکی کوردستانمان گوت مام جەلالو سەرکردایەتی یەکێتی دێنە ئەو ئاهەنگە.. باوەڕ بکە هەر لەرۆژی پێشووترەوە خەڵك هاتنو خێمەیان هەڵداو رۆژی ئاهەنگەکەش خەڵکێکی زۆر زۆر کۆبونەوە.. کاتێك من مام جەلالم پێشکەشی ئەو هەموو خەڵکەکرد.. گوتم زیاتر لەنیو ملیۆن کەس ئامادەبوونە، برادەران گوتیان نیو ملیۆن کەس چییە، ئەو جەماوەرە نزیکەی ملیۆنێکیش ئەبێت..ئاهەنگەکە بەشێوەیەك بوو ئەو دەشتی سورداشە پڕبوو لە خەڵکی کوردستانو وەك دەریایەك وابوو شەپۆلی دەدا.

مەبەستەکەش هەم گەیاندنی بارودۆخی دانوستانەکە بوو بە جەماوەری خەڵکی کوردستانو هەمیش پەیامێك بوو بۆ حکومەتی عێراق کە خەڵکی کوردستان بەدەوری شۆڕشەکەیانەوەن.

***ئەی مەسەلەی دوو باوڵەکەی مام جەلال چییە کە بەتۆی دابوون؟ ئایا هیچ لەبارەی شتەکانی ناو باوڵەکە ئەزانیت کە تا ئێستا باس نەکرابێت؟**

-لەو ماوەیەی لە ناوچەی "سەرشیو" بووین، ڕۆژێك لەسەر داوای جەنابی مام جەلال چوومە سەردانیو لای ئێمەش شەڕەکان وردە وردە قورستر دەبوون..کاتێك لەسەردانەکەم گەڕامەوە مام جەلال دوو باولی بەمن دانو گوتی: ئەرسەلان ئەمە ئەمانەتە لاتو شتی منی تێدایەو لای تۆ ئەبێت، مەگەر مەرگی خۆت ئەگەرنا ئەبێ بیانپارێزی، چونکە هەرچی یادەوەریو نوسنی من هەیە لەو دوو باولەدایە. منیش لەگەڵ خۆمم هێنانەوەو لەماڵەکەی خۆم لە بەرگەلۆ لەژێر خێمەکەی خۆم دامنان..

"هێرۆخان"یش گوتی منیش دێم.."هێرۆخان"و دوو پێشمەرگەو خۆمو ئەو چەند پێشمەرگەی لەگەڵم دابوون، بەپێیان هاتینەوە سەرشیو.."هێرۆخان هەفتەیەك تا دەڕۆژ لەسەرشیو لامان مایەوە.. لەو ماوەیەدا لەگەڵ پەخشان خانو

کاك یوسف زۆزانیو بەکر پـیرۆت زۆر بەخۆشـیمان بەسـەربردو ئەو کات پەخشان خانی خێزانیشم لەوێ بوو..پاشـی ماوەیـەك ژماریـەك پێشـمەرگەی سـکرتاریەتی مـام جـەلالیش هـاتن بـۆ سەرشـیو لەوانـە"مام ئەحمـەدی دادیو حـاجی عوسمـانی کـورداوەو مـام سـالّحە رەشـی مالومـە" بـوون. کـە هێرۆخـان لـەلامان بـوو چـەند سـەفرەیەکی خۆشمـان بـۆ قـەد پـالّی شـاخەکانو سەرچـەمو کانیاوەکـان کـردو دواتـر "هێرۆخـان" گەڕایەوە.

پاش ماوەیەك کە هێشتا بارەگاکانمان لە بەرگەلّو بەتەواوی جێگیر نـەکردبوو، بروسـکەیەکم بۆهـاتو داوایـان لێکـردین کـە بۆکۆبوونـەوەی سـالآنەی سـەرکردایەتی بچـینە بالیسـان. بەرێکەوتینو دوو شـەوو دوو رۆژ بـەرێوە بـووین تـا گەیشـتینە بالیسـانو لـەوێ کۆبوونـەوەی سـەرکردایەتیمان کرد..لـەناو کۆبوونەوەکەدا بووین هەوالّێك هاتو گوتیـان حکومـەتی عێـراق بەتەمای پەلاماردانی ناوچەی سـەرگەلّوو بەرگـەلّووە. ئـەوکات بارەگای مەلّبەندی سلێمانیو راگەیاندن لە سەرگەلّوو بەرگـەلّو بوو، ئەوسا کاك عـەلی بچـکۆلّ لـەوێ بەرپرسـی مەلّبەنـد بـوو، جگە لەوان کاك مستەفا چـاورەشو کـاك ئـاوات عەبدولغـەفوور کاك شێخ داراو شێخ عەبدولکەریمی شەدەلّەش ئەندام مەلّبەند بوون.

بەهــەرحالْ کــە هەواڵەکــە گەیشــت، مــام جــەلال لــەناو کۆبوونەوەکەدا بانگی کردمو گوتی کوا باولەکانم؟ گوتم وەڵا لەماڵەوەن لەبەرگەڵو.. گوتی جا هەرچییەکیان لێ بەسەر بێت خۆت لێی بەرپرسیاری. گوتم مام جەلال خۆ ئەمە چیسەی توتن نییە، قەڵـەمێك نییـە بۆ هـەموو شـوێنێك لەگـەڵ خـۆمی بگێرم.

کـەوای گـوت خـۆم لـە کۆبوونەوەکـە دزیـەوەو چـومە سـەر جیهازەکەو هاوارم بۆ کاك "جەبار فەرمان" برد، ئەو کات کـاك جــەبار لــە هەڵــەدن بەرپرســی رێکخــراوی کۆمەڵــە بــوو. هاورێیەتیشمان بۆ سەردەمی زیندان دەگەڕایەوە کە بەیەکەوە زیندانکرابووین. گوتم کاك جەبار مەسەلەیەکی ئاوا هەیـەو مـام جــەلالیش پێــی لێکــردووم بەکــەوش‌و دەڵــێ ئــەو شــتانەم دەوێتــەوەو شــتێکیان لــێ بەســەر بێــت تــۆ خــۆت بەرپرســیار دەبی. گوتم بـەقوربانی چـاوتم فریامکـەوە..کاك جـەبار گـوتی هــیچ نییــەو خــەمت نــەبێت..دوای دوو رۆژو شــەوان بــە مەفرەزەیەکدا باولەکانی پێگەیاندمو منیش یەکسەر تەسـلیمی مام جەلالم کردنەوەو بەپێکەنینەوە گوتم مـام جـەلال جـارێکی دیکە من شتی جەنابت لای خۆم هـەڵناگرم. ئێمـە کـە چووینە خــەتێ‌و ناوچــەی بالیســان بۆمـاوەی مانگێـك لــەوێ ماینــەوە بەهۆی مانەوەشمان ناردم پەخشان خانی خێـزان هـاتو مـاڵی ئاوا بێـت "قاسـم "عـەزیزو وەعدییـەی خێزانـی" لـە ماڵەکـەی خۆیان شوێنیان بۆکردینەوەو خۆیان چوونە شوێنێکی تر.

# گوشاری سەر رێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەران و مەسەلەی کۆمیتەی هەرێمەکان

***مەبەست لە بەیاننامەی کۆمیتەی هەرێمەکان چی بوو، کێ و چۆن نوسراو مەبەستتان چی بوو؟**

-بەڵێ مەبەستمان لە بەیاننامەکە ئەوەبوو کە بەبرادەرانی سەرکردایەتی کۆمەڵە بڵێین دوای رۆیشتنی ئەوان چی روویداوە..چونکە من کە بۆ دواجار مامۆستا جەعفەر عەبدولواحیدم بینی، باسی چوونە ئێرانی لەگەڵ من نەکرد.. بەڵکو بەمنی گوت ئێمە دەچینە سلێمانیو بەرنامەیەك دادەنێینو دەچینەوە شاخو لەجێگایەك خۆمان حەشاردەدەینو بەرنامەی مقاوەمەت دادەنێین، بەلاّم کە من چوومە لای کاك ئازاد هەورامی لە کەرکوكو دواتر بەیەکەوە چووینە سلێمانی بۆم دەرکەوت کە ئەوان "سەرکردایەتی کۆمەڵە" رۆیشتوونو کوردستانیان بەرەو ئێران جێهێشتووە !.
من نەمدەزانی ئەوان لەئێران گیراون یان چیان

بەسەرهاتووە؟! بۆیە کە ئێمە لەدوای ئەوان ئەرکی ڕێکخستنمان گرتە ئەستۆ، بەیاننامەکەمان دەرکردو ویستمان بیگەیەنینە ئەوانو پێیان بڵێین ئێمە ئەو کارەمان کردووەو وەزعەکەش خراپە..

دوای ڕۆیشتنمان بۆ دیوی ئێران لەسەر سنوور، کاک ئاوات نامەیەکی بۆ برادەرانی ناوشار" کاک ئارامو کاک سالار" نووسیو گوتی خۆمان داوەتە دەست قەدەر"یان گاڵ دێنێ یان پەمۆ". چونکە ئێمە نازانین چیمان بەسەر دێت..نامەکەی بەکابرای قاچاخچیدا ناردەوە، کاک ئاوات خۆی کارەکەی ڕێکخست، من نەمدەزانی ئەو پەیوەندییە چۆنەو چۆن ئەو کابرایە نامەکە دەبات..کە لەودیو گیراین..بەیاننامەکەمان پێشتر دڕاندبوو..چونکە چارەنووسمان دیار نەبوو!. بۆیە نەمانتوانی بەیاننامەی کۆمیتەی هەرێمەکانی ئێمە بگەینینە سەرکردایەتی کۆمەڵە.

***ئێوە وەک ڕێکخستنی کۆمەڵە بۆ لەسلێمانی نەمانەوەو لەگەڵ هاوڕێیانی دیکە سەرکردایەتی ڕێکخستنەکانتان نەکرد؟**

-ڕاستی من گەنجێك بوومو لەهەولێر چووبوومە سلێمانی، هەولێرێکی ئارامو بێ تەکەتولات، لە"سلێمانی" لەناو هاوڕێیانی کۆمەڵە ململانێکە توند هەبوو، بەلام من ئەو بارودۆخەم پێ هەزمنەکراو لەخۆم رانەبینی لەناو ئەو هەموو

ململانێو تەکەتولاتەدا هەڵبکەم، بەتایبەت بەشێکی زۆری ئەو هاوڕیانەی ئەمناسین پێشتر بەرپرسی من بوون لەوانە "کاك سالارو کاك ئارامو محەمەد قەرەداغی". بۆیە لەخۆم رانەدیت دەرقەتی ئەوانە بێمو پێم باشتر بوو بچمە لای سەرکردایەتیو لەگەڵ خۆشم کاك ئاوات عەبدولغەفور ببەم، چونکە کاك ئاواتیش لەگەڵ کاك ئارامو کاك سالارو ئەوانی تر هاوسۆز بوو..

***ئەی دواتر کە سەرکردایەتیان بینی، باسی کۆبوونەوەکەی سلێمانیو بەیاننامەکەتان بۆکردن؟ هیچ کۆپیەکی بەیانامەکەتان بۆ سەرکردایەتی برد؟**

–بەڵێ، ئێمە لەخاڵی پۆلیسی "چەمپاراو" لەسەر سنوری کوردستانی رۆژهەلات گیراینو بۆ بەیانیەکەی سعات 8، بەپاسەوانی دوو پۆلیسەوە بردنیانە "بلەکێ"و لەوێوە بۆ بانە، شەوەکەی گوازراینەوە بۆ سەربازگەیەك، یەکەمجار لەوێ زانیم کە پەتاتە بە پەلکەوە دەخورێت. دوای دووشەوو دوو رۆژێك رەوانەی زیندانی سەقزیان کردین.. کەچووین برادەرەکانی دیکە لەوێ بوون، هەندێکیانم نە دەناسین، پەیوەندیم لەگەڵ "خاڵە شەهابی شێخ نووریو مامۆستا جەعفەر عەبدولواحید" هەبوو، ئەوانیتر"کاك عومەری سەید عەلیو کاك فەرێدون عەبدولقادرو کاك عەلی بچکۆڵ" بوون. من ئەوانی دیکەم

لەنزیکەوە نەدەناسین، کاتێك چووینە ژوورەوە گوتیات: ئەریٚ وەلـلا ئەمـە هاوڕێیـانن‌و باوەشـیان بـە کـاك ئاواتـدا کـردو تۆقەکیشیان لەگەڵ من کرد.

دواتر خاڵە شەهاب‌و مامۆستا جەعفەر عەبدولواحیـدیش بۆ بـەخێرهاتنمان هـاتن‌و لەسـەر بەتانیـەك دانیشـتین، زیندانەکـە 60-70 کەسی تێدابوو، لەویٚ ئەو هاوڕێیانەی دیکەشم ناسـین، راستی من کاك عەلی بچکۆڵم هەر نەدیبوو، کاك عومەری سـەید عەلیم ناسیەوە، چونکە پێشتر لە گوندی "کێلوو" سـاڵی 1975 بینیبووم، کاتێك لەمانگی 3دا شـۆڕش توشـی کارەسـات بـوو، گـەنجێکی بـاریکم بینـی هـەردەهات‌و دەچـوو، گوتیـان ئەمـە عومەری سەید عەلیە.. کـاك فەرێدونیشـم جارێـك لـە پێنجـوێن لەپێشـی سـەیارەیەك بینیـی بوو..بۆیـە ئـەم دوانـەم بـیر دەهاتنەوە، بەڵام تێکەڵاویم لەگەڵیاندا نەبوو.

لەزیندانی سەقز لەبەر قەڵەباڵغی لەنزیك دەرگا شـوێنێکیان بۆ کردمـەوە، ئـەوان هـەموویان سـەرکردایەتی کۆمەڵـە بـوون‌و منیش تەنها کادیرێك بووم..کاتێك دانیشتین لەگەڵ کاك ئـاوات هەموو شتێکمان بۆ سەرکردایەتی باسکردن‌و پێمان گـوتن کـە لـە کوردسـتان چـی بـووەو چـی قـەوماوەو ئێمـەش چـۆن هـاتووین..دواتر مـن بـەجیا هـەموو شـتە نهێنیـەکانم بـۆ خاڵـە شـەهاب‌و مامۆسـتا جەعفـەر بـاس کـردو گـوتم لـە سـلێمانی ململانێیـەکی زۆر تونـد هەیـەو گلـەیی زۆریـش هەیـەو دەڵـێن

دەبوایە سەرکردایەتی نەڕۆن و لێرە بمێننەوە و مقاوەمەت بکەن.. بۆیە منیش لەنێو ئەو هەموو ململانێیەدا نەگونجام و بەباشم زانی بێمە لای ئێوە.. نەشمانزانی ئێوە گیراون، وامانزانی ئێوە دەربازبوون.

دەرکردنی بەیاننامەکەشمان لەگەڵ خاڵەشەهاب و هاوڕێیانی تر باس کرد، گوتمان بەیانەکەشمان پێ بوو، دڕاندمان.. بەڵام ئەو کات کێ دەیپرسی کۆمیتەی هەرێمەکان چیە؟ کۆمەڵە روو لەشکست بوو..برادەران رۆیشتبوون..

* * *

## گیرانی سەرکردایەتی کۆمەڵە لە ئێران و رادەستکردنەوەیان بە عێراق

***ئێوە لە زیندانی سەقز گیران، چیتان بەسەر هات و برادەرانی دیکەتان لەکوێ دیتنەوە؟**

-لەزیندانی سەقز خاڵەشەهاب و ئەوانی دیکە بەدوو مانگ حوکمـدرابوون و رۆژی 31-12-1975 سزاکەیان تەواو دەبوو..من و کاک ئاوات عەبدولغەفوریش چەند جارێك بە کەلەپچەوە برابووینە بەردەم دادگا..هەموو جارێکیش بەناو خەڵك و بازاڕی سەقزیاندا دەبردین و کەسیش نەیدەزانی لەسەر چیو بۆچی گیراوین؟ بۆ ئێمە لەڕووی دەروونیەوە زۆر ناخۆش بوو..کاری دادگاکە وا رێکخرا بەمانگێك حوکمدراین و چارەنوس و دۆسێکەمان لەگەڵ هاورێیانی دیکە بوو بەیەك چارنووس.

دادوەرەکە لێی پرسین بۆ هاتوون، گوتمان راماکردووە..گوتی ژمارەیەکی دیکەش بەر لە ئێوە هاتوون، بۆیە کێشەکەتان دەکەم بەیەك..دوای مانگێك لە 27/28-12-1975 ئێمە هەر حەوتمان بۆ شاری سنە گوازراینەوە و لەوێش دوای دووسێ رۆژ زیندانی شەوی 30/31- 12-1975، بردنیان بۆ

سەربازگەیەکی سوپای ئێرانو لەوێ هەموو کەلو پەلێکیان لێوەرگرتینو قەیتانی پێڵاوەکانیشیان لێکردینەوە، ئەترسان نەوەك خۆمان بکوژین..چونکە پێشتر پێیان گوتبووین رادەستی حکومەتی عێراقتان ئەکەینەوە! . شەوێکیش لەو سەربازگەیەماینەوەو دواتر لەگەڵ ئەفسەرێكو چەند سەربازێك..بەرەو عێراق کراینەوەو ئێوارەکەی گەیشتینە بنکەی پۆلیسی "بناوەسووتە"ی پشتی پێنجوێن، رادەستی حکومەتی عێراق کراینەوەو دوای چەند سەعاتێکیش ئەفسەرێکی عەرەب نووسراوی راگواستنی بۆ کردینو رەوانەی پێنجوێنی کردین ئەو شەوە 31-1-1976بوو..دوای چەند رۆژێك بەسەر پەرشتی جێگری ئەمنی سلێمان لەپێنجوێنەوە بەرەو سلێمانیان بردین..لەوێ لێکۆڵیەوەیان لەگەڵ خاڵەشەهابو مامۆستا جەعفەرو کاك فەرێدون کرد، بەڵام ئێمەیان بۆ لێکۆڵینەوە بانگ نەکرد. دوای چەند رۆژێك بەسەرپەرشتی "ملازم کەریم" ناوێك ئێمەیان بردە ئەمنی عامەی بەغدادو لەوێ زیندانی کراین.. کە چووین هاورێیانی دیکەش هەموو لەوێ بوون، لەوانە "جەبار فەرمانو عوسمانی نانەواو ئەنوەر زۆرابو ئاسۆی شێخ نوریو حەمەی میرزا سەعیدو کەمالی ئەلەکەو سەعدون فەیلیو سەلام برزۆو د.جەمیلو چوار پێنج کرێکاری کۆمپانیای پەلەوەری هەولێریشی لێ بوون. برادەران

کە ئێمەیان بینی تووشی سەرسوڕمان و شۆك بوون..چونکە وایان ئەزانی ئێمە دەرچووین و رزگارمان بووە.

***ئایا ئێوە هەر لە سجن بڕیارتان دابوو یەك کوتلە بن، یان لیکنزیکبوونتان شتێکی خۆرسك بوو؟**

—لەبارەی کوتلەو کوتەلەکاری زیندان، کاتێك کە ئێمە لەزیندان بەربووین.. نامەیەکی جەنابی مام جەلال گەیشت..کاك عومەری سەید عەلی و کاك عەلی بچکۆڵ هاتبوونە هەولێرو نامەکەیان هێنابوو..کاك جەبار فەرمان و صبیحەخانی خێزانیشی لە هەولێر بوون.. لە ماڵی شەهید جەعفەر عەبولواحید ژوورێکیان گرتبوو..چونکە ئەوکات کاك جەبار لە دەواجن دامەزرابوو..رۆژێك پێیگوتم پێش ئەوەی بگەڕێیەوە گوندی خۆتان کارێکم پێتە..کە چوومە لای گوتی برادەران هاتوون و نامەکەی مام جەلال هاتووەو داوا دەکات کە بڕۆینە شاخ و پەیوەندی بکەین.

ئەوسا کارەساتی هەکاری رویدابوو..زۆر لە سەرکردەکانی یەکێتی شەهید ببوون و گیرابون..من جاری یەکەم بەتەما نەبووم بڕۆم..دواتر کاتێك قسەم لەگەڵ پەخشانخان کرد رای وابوو بڕۆم..پەخشان خۆی لە هەڵەبجە مامۆستا بوو، پەیوەندیشی بە کۆمەڵەوە هەبوو، بەریدی کۆمەڵەی دەبردو دەهێنا..پێش ئەوەی من پەیوەندی بکەم..کاك فەرێدون و

عومــەری ســەید عــەلیو ئــەنوەر حەســەنو عــەلی بچــکۆڵ پەیوەنـدیان بـە شـاخەوە کردبـوو..من یەکـەم جـار لـەرێگای "بێوران"ەوە چوومە شاخو رەحمـەتی کـاك "حەمیـدی کـەریم شـانە" هاوکـاری کــردمو لــەوێ ولاغــێکم گرتــوو چــوومە ناوزەنگ..نامەی کاك"حاجی مەمۆم" پێ بوو، ئەو کات حاجی مەمۆ بەرپرسی کۆمیتەی کۆمەڵە بوو لە هـەولێرو نامەکـەم بـۆ کاك نەوشیروان برد.

من کە چوومە پێشمەرگایەتی..جیا لەبرادەرانی زیندان کاك ســالار عــەزیزم دەناســی، چــونکە لــە کۆمەڵــەدا بەرپرســم بوو..لەڕووی خێزانیشــەوە تێکـەڵاویمان هەبوو..چـەندین شـەو لــەماڵیان مابوومــەوەو دایکــیو روونــاك خــانی خوشـکی زۆر خزمــــەتیان کـــــردووم..زۆر سوپاســــیان دەکــــەم ئەگــــەر مابن..حەتمەن لەوانەیە دایکی مردبێت..لەبەغداش لەگەڵ کـاك سالار هەر تێکەڵاوبووین..

لە راستیدا کـە چـوومە شـاخو پێشـمەرگایەتی بەپشـتیوانی کاك سالار چووبووم، ئـەو کـات کـاك سـالار ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسی بوو، کاتێك چووم ئەو لەوێ نەبوو..بۆیە دواتر چـوومە لای کــاك نەوشــیروان..ئەوانی تــریش کــاك مــەلا بــەختیار پێشوازییەکی زۆر گەرمی لێکردمو میوانداری کردم..زۆر چـاوی لێم بوو هەر زووش بووین بەبرادەر.

***مـــەلا بـــەختیار دەڵـــێ: لـــەکاتی گیرانـــی ئێـــوەو رادەستکردنەوەتان بەعێراق شەهید ئـارام گوتوویەتی:" مـن هاوڕێ شەهاب بناسم سەرمان بەرز ئەکاتەوە، بەڵام ترسم لـە هەندێکی دیکە هەیە! هەر واش دەرچوو!. خۆت ئەزانی خاڵە شیهابو هاورێکانی لەسێدارەدرانو ئێوەو هاورێکانی تریش " عومەری سەید عەلی+فەریدون عەبدولقادر،..تاد" ئـازاد کـران ئایـا ئـەو گومانـەی شـەهید ئـارام هـەبیووە لەسـەر زاری مەلابـەختیار مەبەسـتی ئێـوە بـووە یـان کەسـانێکی دیکە؟!** ..."کتیبی ئازاد هەورامی،لا.21".

–مەسەلەی هەڵویستی برادەرانی سەرکردایەتی لـە زینـدان، من بۆ مێژوو دەیلێم، هەر هەموویان قارەمـان بوون..قارەمانـە هـەرە گەورەکـەش کـە لـە هـەموویان زیـاتر ئەشـکەنجەدرا، مامۆستا "جەعفـەر عەبدولواحیـد" بوو..کاتێك ئەشـکەنجەیان دەدا لەسەر دەستو پێ دەرۆیشتو دەهاتەوە..خاڵە شەهابی شێخ نوریش بەراستی قارەمان بوو.. شەوی واهەبوو تا بەیانی خاڵە شەهابیان دەبردو نەیان دەهێنایەوەو هەر ئەشـکەنجەیان ئەدا، لەڕووی دەروونیەوە گوشاریان دەخستەسـەر.. مامۆسـتا جەعفەر کـە دەهاتـەوە ژوورە تـەنهاکـەی خۆی..دەرگایـان بـۆ دەکردەوە ئەوجا خواردنیان بـۆ دادەنـان چـونکە نەیدەتوانی هەستێتە پێـوەو لەپەنجەرەکـەوە خـواردن وەربگرێت..لەگـەڵ ئەوەشـدا مامۆسـتا جەعفـەر لـە قارەمـانێتی خـۆی نەدەهاتـە

خوارەوە..هەموو هاوڕێیانی سەرکردایەتی سجن قارەمانی بێوێنە بوون..قارەمانێتیان مەگەر بەداستان بگێڕدرێتەوە..لەژێر ئەو هەموو گوشارو ئەشکەنجەدانەشدا یەك کەسیان قسەیەکی نەدرکاند.

بە هۆی خۆڕاگری ئەو برادەرانەی سنجیشەوە بوو رێکخستنەکانمان پارێزراو بوون، بەلاَم خالە شەهاب وەك سکرتێری کۆمەڵە بووە قوربانی..خالە شەهاب خۆی گوتی.."من بەرپرسی ئەوانەم.. گوتی ئێمە رێکخستنمان نییە..کۆبوونەی حزبیمان نەکردوەو پارەو ئابوونەشمان نەداوە، ئەم سێ شتەش مەرجی رێکخستنن و ئەوەشمان نەکردووە..بەلاَم من بەرپرسی ئەو گەنجانەم و ئەوانە هەمویان منداڵ و گەنجن و من لەهەموویان گەورەترم، من رێنماییم کردوون..من بۆ خوێندەواری و رۆشنبیری رێنمایم کردوون و هیچی تر".

ئەنوەر زۆرابیش..دەمانچەیەکی پێگیرابوو.. مامۆستا جەعفەریش سەفەری چوونە دەرەوەی عێراقی لێ ئاشکرا بوو.. بۆیە ئەو سێیەیان بوونە قوربانی رێگای خەبات و کوردایەتی و لەسێدارەدران، یادیان هەتا هەتایە لە ویژدان و مێژووی کوردایەتیدا بە زیندوویی دەمێنێتەوە..بەلاَم بەراستی مامۆستا جەعفەر عەبدولواحید یەکەم قارەمانی ئەو زیندانە بوو..هەرکاتێك کە لە ئەشکەنجەدان دەیانهێنایەوە.. بۆ

ئەوەی ورەی ئێمە نەڕوخێت بەدەنگێکی خۆشو بەرز گۆرانی "عەبدولوەهاب"ی بۆ دەگوتین، دەیویست هەست بەو هەموو ئازارەی نەکەین.

هەر کەسێك قسەی وای کردبێت هەڵەی کردووە.. رێزی زۆرم بۆ کاك ئارام هەیە، پیاوێکی قارەمانو شەهیدێکی گەورەیە لە لام..بەلاّم دلّنیام کاك ئارام قسەی وای نەکردووە..چونکە هەرحەوت سەکردەکەی کۆمەڵە زۆر قارەمان بوون، با کاك بەختیارو هەرکەسێکی دیکەش یەك بەلّگە بێنێت کەوا ئەو حەوت کەسە یەك قسەیان لەسەر هەر کەسێكو هاورێیەکی کۆمەڵە کردبێتو رێکخستنێکیان ئاشکرا کردبێت..یان نهێنیەکیان درکاندبێت. بەشی زۆری ئەو برادەرانە ئێستا ماون..بەلاّم ئەو قسانە بۆ شکاندنی برادەرانی سجن دەکرانو هەر هەمان نەفسیەتو ململانێی شاخە لەسەری بەردەوامن. من خۆم نەمبیستووە کاك ئارام رۆژێك لەرۆژان باسی ئەوەی کردبێت.

***پێتانوایە دوای شهیدبوونی ئارام، مەلابەختیار پێیوابوبێت شوێنگرەوەیەتیو ئێوەش وەك گروپی سجن پشتیوانی کاك نەوشیروانتان کردووەو بەمەش جێگاتان بە کاك بەختیار لەقکردووە لەوەی ببێت بە سکرتێری کۆمەڵە.؟**

–من نەمزانیووە هیچ کاتێك کاك مەلا بەختیار بەرپرسی یەکەمی کۆمەڵە بووبێت، یان خۆی بەو ناوە ناوزەد کردبێت کاك سالار لەپێش مەلا بەختیارەوە بوو.. چونکە کاك سالار ئەندامی ناوەندی کۆمەڵەو ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو، بەڵام کاك مەلا بەختیار ئەندامی ناوەندی کۆمەڵەو تەنها ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی بوو..ئەندامی مەکتەبی سیاسی نەبوو..بەڵام پیاوێکی هەڵسوڕاوو وریاو تێکۆشەر بوو..خوا هەڵناگرێ فەرماندەیەکی سەربازی ئازاو ماندووش بوو..من کە لەشاخیش بووم لەگەڵ کاك مەلابەخیار هەر تێکەڵ بووین.

*تۆ کەی کاك ئارامت ناسیوەو بینیووە؟

–من لە زووەوە کاك ئارامم دەناسی، لەدوو شوێن ئیشمان بەیەکەوە کردووە..یەکەمیان لەرۆژنامەی "هاوکاری" چونکە کاك ئارام لەرۆژنامەی هاوکاری گۆشەیەکی هەبوو، منیش کە لە بەغداد بوومو خوێندکار بووم، لەرۆژنامەدا کارم دەکرد..بەڵام کاك ئارام لەوێ برا گەورەو مامۆستام بوو.

هەروەها جاری دووەم، لە پێشمەرگایەتی سەردەمی شۆڕشی ئەیلول لە 1974–1975 کاك ئارامم بینیووە، ئەو کات هەردووکمان ئەندامی کۆمیتەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بووین لە چۆمانی باڵەکایەتیو کاك جەمیل رەنجبەر بەرپرسی کۆمیتەکە بوو..خاڵە شەهابیش سەرپەرشتی دەکردین.

***سەرەتای تێکچوونی پەیوەندی تۆو کاک نەوشیروان چی بوو، کەی دەستی پێکرد؟**

-کاک نەوشیروان پیاوێکی قسە رەق و رووشکێن بوو، من تا شەش، حەوت مانگێکیش هەر لە کاک نەوشیروان نزیک بووم و دوور بەدووری پەیوەندیم لەگەڵ مام جەلال هەبوو. بەڵام دواتر وردە وردە..بەلای مام جەلالدا شکامەوە..کاتێك کاک نەوشیروان کارەکەی وابینی، دڵخەکەی زۆر پێ ناخۆش بوو..تا ئەو دواییانەش بەردەوام گلەیی لێدەکردم و دەیگوت: کوری باش تۆ لەخوارەوە پێشمەرگە بووی، من تۆم هێنایە رادیۆو کارەکەم رادەست کردی..پشتیوانیم کردی و حورمەتم گرتی و نەمهێشت لەخوارەوە بیت کە لەوانە بوو شەهید بووبایت، کەچی تۆ چوویتە لایەکی دیکەوە.

تا رۆژی جیابوونەوەشی کاک نەوشیروان برای گەورەو لێپرسراوم بوو. هەمیشەش ئەوم بە براگەورەو بەرپرسی خۆم دەزانی، بەڵام ئەو منی قەبوڵ نەبوو.

بەڵام من ئێستاش لەتێکەڵاوییم لەگەڵ مام جەلال پەشیمان نیم، بەڵێ زۆرجار گرژی کەوتۆتە نێوان مام جەلال و بەندە، جاری واش هەبوو ئەو زویر دەبوو، هەندێ جاریش من نارەحەت دەبووم.. بەڵام ئێستاش کە لەنێو گۆڕەکەیدایە، هەر

لای من لەسەرووی هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتیەوەیە.. چونکە مام جەلال سیمبوڵی خەباتو کوردایەتی بوو، کەسایەتیەکی گەورەی کوردو ناوچەکەو جیهانیش بوو.. من لەگەڵ ئەویشدا لە سیاسیەتکردن خۆشحاڵ بووم.

## کۆنفرانسەکانی کۆمەڵەو کێشەکانی

***دەکرێ شتێك لەبارەی کۆنفرانسی کۆمەڵە لە "مالیمۆس" بڵێیت؟ بەتایبەت وەك ئەوەی باسی لێوە دەکرێت کۆنفرانسێکی بێ کێشەو بێشە نەبووە؟**

-ئەوسا کە بارەگامان لە توژەڵەو ناوزەنگ بوو، یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەی رەنجدەران لە "مالیمۆس" بەسترا، پێدەچوو ناوی "مالیمۆس" ناوێکی یۆنانی بێت، ناوچەکە دەکەوتە نزیك گوندی "کانی زەرد"و ئەودیوی سنوری کوردستانی رۆژهەلات. شوێنەکەی زۆر سەخت بوو، بۆ تۆپبارانو بۆمبارانیش زۆر سەلامەت بوو.. بۆیەش کۆنفرانسەکە لەوێ دانرابوو تاوەکو حکومەتی عێراق شوێنەکە

نەدۆزێتــەوەو دەســتی پێنــەگات. لــە کۆنفرانســەکەدا کــاك نەوشیروانو ئەنوەر حەسەنو خولە کۆمەڵەو ئـازاد هـەورامیو بەندە "ئەرسەلان بابیز" لـەژێر سەرپەرشـتی کـاك نەوشـیروان بـووین بـە سەرپەرشــتیاری بــەڕێوەبردنی کــۆنفرانس. لــە کۆنفرانســەکەدا گفتوگــۆی زۆر قــورسو درێژدادڕانــە کــرانو مشـتومڕێکی زۆریشــی لــەنێو ئەنـدامانی کۆنفرانسـدا نایـەوە. ململانێکــان لــەنێوان گروپــی زینــدان بەپشــتیوانی کــاك نەوشیروانو گروپەکەی "کاك مەلابەختیارو کاك سالار عـەزیزو مامۆستا جەعفـەر" بوون..ئـەوان بـەخۆیان دەگـوت کۆمیتـەی هەرێمەکان.

لێرەوە دەمەوێ شتێکیش بۆ مێژوو باس بکەم، ئێستا کـاك مـەلا بـەختیارو کـاك سـالارو ئـەوان وای نیشـان دەدەن ئـەوان کۆمیتــەی هەرێمــەکانیان دروســت کــردووەو هــەر ئــەوانیش خـاوەنین. بـەڵام راسـتیەکەی وانییـە!؟ چـونکە کـاتی خـۆی کۆمیتــەی هەرێمــەکان لەســەر دەستی"ئیحســان کــەرکوکی- ئەبوشەهابو ئازاد هەورامیو عوسمـانی نانـەواو مـن" دروسـت بـووە. کاتێـك کـە مامۆسـتا "جەعفـەر عەبدولواحیـد" ئـەمری گرتنــی دەرکــراو دواتــر رۆیشــت، پــێش رۆیشــتنەکەی مــن لەخانوێکی بچووکی قوڕ لە گەڕەکی بیرێژیانی شاری هەولێر بۆ دواجار بینیم، من لەرێگای "نەرمین خان"ەوە چومە لایو پێی گوتم "تۆ" لەمـەدوا سەرپەرشـتی رێکخسـتنەکانی کۆمەڵـە لـە

هـەولێر دەکـەیتو دواتـر ئێمـە خەبـەرت دەدەینـی تـۆ چـی دەکەیتو ئێمەش دەچینە کوێ؟

کاتێـك ئـەمری گرتنـی منـیش دەرچـوو، بـۆ خۆشـاردنەوەم چـومە لای کـاك ئـازاد هـەورامی لەگـەڕەکی ئیسـکانی شـاری کەرکوكو هەفتەیەك لای مامەوەو دواتر بەیەکەوە چوینە شاری سلێمانی.. کاك ئازاد هەورامی ئەوکات بەرپرسی کەرکوك بـوو، مـن بەرپرسـی هـەولێر بـوومو عوسمـانی نانـەواش بەرپرسـی سلێمانی بوو.. ئێمە هەرسێکمان بەسەرپەرشتی ئـەبو شـەهاب لەسلێمانی کۆبووینەوە، چونکە ئەبو شەهاب لـەڕووی تەمـەنو پلەی حیزبی هەم لە ئێمە گەورەتربوو هەمیش بـەتواناتر بـوو. نەشمان ئەزانی چـی بکـەین.. چـونکە ئێمـە نـە سـەرکردایەتی بـووینو نـە دەسـەڵاتی سەرکردایەتیشـمان هـەبوو.. ویسـتمان بەیاننامەیەك دەربکەینو لەرێگەیـەوە ورەی برادەرانمـان بـەرز بکەینـەوەو مەعنەویـەت بـە هاورێیـانی رێکخسـتنی کۆمەڵـە بدەینەوەو ئومێدیان پـێ ببەخشـینەوە، چـونکە بارودۆخەکـە دوای خۆشـاردنەوەو گرتنـی هاورێیـانی کۆمەڵـە زۆر شـڵەژابوو..بەیاننامەکەمان نووسـی.. گوتمـان بـەناوی چـیەوە بێـت، ئێمـە هەریەکـەمان بەرپرسـی کۆمیتـەی شـارێك بـووین "هەولێر- سلێمانی- کەرکوك".. بۆیە گوتمان با بەیانەکـەمان بـەناوی "کۆمیتـەی هەرێمـەکان" بێـتو وا بلاوبکرێتـەوە. بەیاننامەکـەمان بـەناوی "لێمونـدوزی" نوسـیی‌و مـنو ئـاوات

عەبدولغەفوور ویستمان بیگەیەنینە دەستی برادەرانی خۆمان لەو دیوی ئێران.. بەڵام کە ئێمە گیراین، بەیاننامەکەمان دڕاند.. ئێستاش کاک ئیحسان کەرکوکیو عوسمانی نانەوا ماون بۆ شاهیدی ئەوەی کەوا ئێمە ناوی کۆمیتەی هەرێمەکانمان داناوە.

دوای ئێمە ئەو برادەرانەی ئەوساو ئێستا خۆیان بەخاوەنی ناوی کۆمیتەی هەرێمەکان دەزانن، "کاک مەلا بەختیارو کاک سالارو مامۆستا جەعفەر" بە هەمان ناو شتێکی وایان دەرکردو مەسەلەکەیان کرد بەهی خۆیان.. بەهەرحاڵ ئەوە راستی مەسەلەکەیەو بۆ ئەوەی کردیشیان بەهی خۆیان گەردنیان ئازا بێت.

*کەی بووی بە ئەندامی سەرکردایەتی؟

–لە کۆنفرانسی "مالیمۆس" کاتێک هەڵبژاردن بۆ سەرکردایەتی کرا، سەرەتا تەنها سێ کەس دەرچوونو "منو کاک ئازاد هەورامیش" بەیەدەگی سەرکردایەتی دەرچووین. بەڵام دواتر لەبەر گرژیو ململانێی نێوان دوو گروپەکەی نێو کۆمەڵە هەڵبژاردن بۆ ئەوانی دیکە نەکراو هەروازیان لێهێنا، بۆیە "کاک ئازاد هەورامیو من لەساڵی 1982وە حسابی ئەندامی سەرکردایەتیمان بۆکرا. ئەوە بوو من لە هەموو کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتیو مەکتەبی سیاسی یەکێتی

نیشتیمانی کوردستان لە ناوزەنگ بەشدار دەبووم.. تەنانەت جارێکیانو لەیەکێك لە کۆبونەوەکاندا باس لەوە کرا کەوا مەکتەبی سیاسی پێویستی بەهەڤاڵێکی تر هەیە، مام جەلال پێشناری بەندەی کردو گوتی من پێم باشە ئەرسەلان بایز ببێتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی.. من وەڵامم دایەوەو گوتم مام جەلال من ناتوانم ببمە ئەندامی مەکتەبی سیاسی.. لە کۆبوونەوەکەدا مام جەلال هیچی نەگوت، دوای کۆبوونەوەکە مام جەلال گوتی وەرە دەچین لەماڵەوە بەیەکەوە نان دەخۆین، بەینی ماڵی مام جەلالو بارەگای مەکتەبی سیاسی لە ناوزەنگ سێ سەد مەترێك دەبوو، لەو ماوەیەدا مام جەلال بەتوندی قسەی کردو لێم تورە بوو، دوایی کە چوینە ماڵەوەو دانیشتین.. من گوتم جا مەجالی قسەکردن بۆ منیش هەیە.. گوتی ..ئا. بەڵام گوتیشی چۆن دەبێ من پێشنیارت بکەم بۆ مەکتەبی سیاسیو تۆ رەتی بکەیتەوە؟! گوتم مام جەلال لەلای من مەکتەبی سیاسی دەزگایەکی زۆر زۆر گەورەیەو سەرکردایەتی شۆرش هەر لە زاخۆوە تا خانەقین دەکا، من ئێستا لەخۆم رانابینمو ناشمەوێ وەك هەندێك لەبردەرانی دیکە بمو کەفائەتم نەبێو شایستەی ئەو شوێنە نەبم.. جارێ لێمگەرێ خۆم پێ بگەیەنمو خۆم دروست دەکەمو دوای چەند ساڵێکی تر ئەوجا ئەبمە ئەندامی مەکتەبی سیاسی. کەوام گوت مام جەلال هیچ قسەیەکی دیکەی نەکرد.. دیاربوو

قەناعەتی بە قسەکەی من هات. من بڕوام وابوو، نابێ هەموو کەس بە ئاسانی ببێتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانو سەرکردایەتی شۆڕشێکی گەورەی میللەتی کورد بکات.

***ڕاستە ئەڵێن کاك نەوشیروان ویستوویەتی ناوی "هاوێر"ی کچتان بنێت کۆنفڕانس؟**

–بەڵێ ڕاستە، کاتێك کۆنفرانسی کۆمەڵە لە "مالیمۆس"ی گوندی کانی زەردی کوردستانی ڕۆژهەڵات بەسترا.. من ئەو کات بەشێك بووم لە لێژنەی سەرپەرشتی کۆنفڕانسەکە کە پێکهاتبوون لە "شەهید ئازاد هەورامیو ئەنوەر حەسەنو خولە کۆمەڵەو من" بە سەرپەرشتی کاك نەوشیروان..

لەپڕ کاك نەوشیروان گوتی وەرە، خەبەرم بۆ هاتووە، دەڵێن پەخشان نەخۆشەو کچێکتان بووە، پێمباشە بچیەوە لایو لە کۆنفرانسیشدا خەبەرەکەی ڕاگەیاندو گوتی ئەوە ماڵی ئەرسەلان کچێکیان بووەو ناویشمان ناوە کۆنفرانس، دنیا بەرەو شەو دەچوو، مۆڵەتم وەرگرتوو لەگەڵ دوو پێشمەرگەدا گەڕامەوە ماڵەوە.. کە دەرگام کردەوە بینیم پەخشان وەك خۆیەتی.. منیش پێکەنیمو حەپەسام.. پەخشان گوتی ها چیبووە.. گووتم وەڵڵا پێیان گوتم کچێکتان بووە بۆیە هاتومەتەوە.. گووتی وەڵڵا وەك خۆمم وا دەبینی! ئیتر گەڕامەوە کۆنفرانسو بەکاك نەوشیروانم گوت خەبەرەکە

وانەبووە، بەڵام دەمەوێ پەخشان بنێرمە تاران، چونکە وەزعی زۆر باش نییە،ماڵی ئاوابێت رەزامەندی دەربڕی و پەخشانمان لەگەڵ "نەرمین" کە پێشمەرگەیەکی ناوەندی راگەیاندن بوو، کچێکی زۆرباش بوو ناردە تاران،.. دوای بیست رۆژێکیش تاوەکو کۆنفرانس تەواو بوو، ئەوجا مۆڵەتم وەرگرت و چوومە لای پەخشان و هێشتاش منداڵەکەمان هەر نەببوو، لەوێ لای پەخشان مامەوە تا کچەکەمان بوو، هێنامانەوە بۆ ناوزەنگ.

دوای چەند رۆژێک من لەگەڵ کاک حەمە تۆفیق بە نوێنەرایەتی کاک نەوشیروان و کۆمەڵە بەئەرکی گەیاندنی سەرەنجامی کۆنفرانس و روونکردنەوەی سیاسەتی کۆمەڵە بۆ حزبی دیمکرات و کۆمەڵەی کوردستانی رۆژهەلات چووینە سەفەرو بارودۆخی کۆنفرانسەکەمان بۆ باسکردن.

دواتر کە هاتمەوە، گوتم پەخشان کوا منداڵەکەمان، گووتی لەرێگەی کاک مەلا بەختیارو روناک خانی خێزانییەوە ناردمانەوە بۆ سلێمانی.. چونکە خۆت ئەزانی لێرە بەخێوکردنی قورسەو راکەڕاکی زۆری تێدایە.. پێشتر ناومان نابوو "بێری" چونکە کاتی کۆنفرانسەکە هێشتا لەدایك نەببوو، ناوەکەش بەسەر چوو..گوتی ناویشمان ناوە "هاوێر" و کاک بەختیار ناوەکەی گۆڕیوە بۆ "هاوێر"، منیش دەمزانی هاوێر بەمانای لێك جیاکردنەوەی بەرخ لە مەڕان دێت و.. کاک بەختیاریش هەر بەو

مەبەستە ناوی نابوو.. چونکە کچکەیان لە ئێمە هاوێر کردبوو، ناردبوویانە سلێمانی..

بەلآم چۆن ناردنەوەیەك، بەپشتی ولآغ لە ناوەنگەوە تاوەکو قەلآدزێ، هاوڕێ روونـاك شێخ جەناب بردبوویەوەو سوپاسی دەکەین.. لەسلێمانیش تاوەکو خۆی ئاشکرا نەبێت و نەزانن ئەوە منالی ئێمەیە، مندالآکەی باش مەلۆتکە کردبوو، چووبووە پێش مالی شێخ جەلال لە توی مەلیك و لەبەر دەرگا دایـنابوو، زەنگی لێدابوو، لەدوورەوەش بە ئیشـارەت بەو کەسەی گوتبوو کە دەرگاکەی کردبوەوە، ئەوە مندالی ئەوانەو رۆیشتبوو.. تا نەزانن کێ هێناویەتی.. ئەوانیش کەسەیری مندالآکەیان کردبوو زانیبوویان مندالی ئێمەیە.."هاوێر" تاوەکو پۆلی سێ و چواری سەرەتایش هەر لەمالی ئەوان پەروەردەبوو، مالیان ئاوابێت بۆیان پەروەردە کردین.. ئێستاش "هاوێر" زۆر هۆگری "پەری" خوشکی پەخشانەو گەورەبووەو خاوەنی مال و خێزانی خۆیەتی.

# کێشەی باڵەکانی کۆمەڵەو جیابوونەوەی ئاڵای شۆڕش

***ئایا لە ناو کۆنفرانسی کۆمەڵە لە مێرگەپان، یەکسەر ئاڵای شۆڕش لە یەکێتی جیابوونەوە؟**

-کاتێک کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵە لەساڵی 1984 لە "مێرگەپان" گیرا، ناکۆکی کەوتە نێوان کاک نەوشیروانو کاک مەلابەختیار، بەشێك لەسەرکردایەتیو کادیرەکانی کۆمەڵە لەلایەن کاک نەوشیروانەوە بەوە تۆمەتبار کران کەوا لەژێرەوە رێکخستنیان هەیەو بلاوکراوەو پەخشنامە بلاودەکەنەوەو چەندین بەڵگەشیان بۆ کۆنفرانس خستنەڕوو، گوتیان ئەوانە دەیانەوێت لە ناو کۆمەڵە رێکخستنی جیا دروست بکەن..بەو شێوەیە توندییەکە زیاتر بوو.. لە ئەنجامدا بووە هۆی ئەوەی کاک مەلابەختیار لەگەڵ ژمارەیەك لەو کادیرانەی دەوروبەری خۆی کە پشتیوانیان لە خۆیو کاک سالارو مامۆستا جەعفەر دەکرد لە کۆنفرانسەکە چوونە دەرەوە، دواتر خەڵکی دیکە کەوتنە بەینیانو سەرنجام ئاشتیان کردنەوەو هێنانیانەوە نێو کۆنفرانسەکە.

لەراستیدا ئەو ئاشتەواییەی دروست بوو، ئاشتەواییەکی فشۆڵ بوو، راستە کاک مەلا بەختیار بە سەرکردایەتی کۆمەڵە

هەڵبژێردرایـــەوە، بـــەڵام دوای کۆنفرانســـەکە ناکۆکیـــەکان تەشەنەیان کردەوەو نەتوانرا چارەسەری ئەو ناکۆکیانە بکرێت کـە هـەبوون. بۆیـە کـاک مـەلا بـەختیارو کـاک سـالار عـەزیزو مامۆسـتا جەعفـەرو ژمارەیـەکیش لـە کـادیرانی دیکـە کـە هەندێکیان سەرکردایەتی بـوونو هەندێکیشـیان کـادیر بـوون.. لەگـەڵیان ڕۆیشـتن.. لەوانـە "کـاک عیمـاد ئەحمـەدو مامۆسـتا پشکۆو شێخ عەلیو حـاجی مەمۆ"عـەباس" بەگـەڵ ئاراسـتەی کـاک مـەلا بـەختیار کـەوتن. کـاک مەلابـەختیار بـەخۆیو ئـەو برادەرانەوە بەرەو ناوچەی قەرەداغ چوون.

دوای ئەو ڕووداوە، سەرکردایەتی یەکێتی بە ڕەزامەندی مام جەلال، بڕیاریان لەسەر دانو دەستپێشخەریان کردو هێزیان بۆ گرتنیـان ئامادەکرد..ئـەو بڕیـارەش بـۆ ئـەوەبوو تـاوەکو ئـەو گروپـە زیـانی زیـاتر بـە یـەکێتیو کۆمەڵـە نەگەیـەنن. بـۆ ئـەو مەبەسـتە هێزێکـی گـەورە بەفەرمانـدەیی جـەبار فـەرمان کۆکرایەوەو فەرماندەکانی دیکـەش لەوانـە شـەهید شـەوکەتی حـاجی موشـیرو شـەهید غـەریب هەڵـەدنی فەرمانـدەیی هێزەکـەیان کـردو بـۆ چـەککردنو گرتنـی ئـەو گروپـە بـەرەو ناوچەی قەرەداغ بەڕێکەوتن.

لەوێ کاک مەلا بەختیاریان گرتو چەکیان کردو بـە زینـدانی بردیانەوە بۆ سەرکردایەتی یەکێتی نیشمانی کوردستان. دواتر لە کۆنفرانسی کۆمەڵە لـە بەرگـەڵو کـە 63 کـەس ئامـادەبوون،

تەنها یەك كەس نەبێت كە عەبدوڵڵا تۆفیق بوو، هەموویان واژۆیان لەسەر لە سێدارەدانی كاك مەلابەختیار كرد.

***دوای جیابوونەوەی ئاڵای شۆڕشو دواتر كۆتایی پێهێنانیان، كاتێك كاك بەختیار گیراو بڕیاری گوللەبارنكردنی بەسەردا درا، تۆ واژۆی ئەو بڕیارەت كرد؟**

–من زۆر لە مام جەلال نزیك بووم، تا وایلێهات بوومە كوڕیماڵەكەی ئەو، مام جەلالیش لەماڵ نەبایە، هەردەچووم‌و سەردانی هێرۆخانم دەكرد، ئەوكات هێرۆخان جارجارە چیرۆكی ئەنووسی، چەندین جار گفتوگۆی ئەدەبی لەنێوانماندا دەبوو، دواتر هێرۆخان وازی لەو كارەی هێنا..

لەكاتی جیابوونەوەی ئاڵای شۆڕشو كاك مەلابەختیار من بێ گومان لەلایەنی مام جەلالو كاك نەوشیروان بووم..دژی ئاڵای شۆڕش بوومو چەندین وتاری توندیشم لە دژیان نووسین..كاتێكیش كۆنفرانسی كۆمەڵە لە بارەی تاوتوێكردنی سەركردایەتی یەكێتیو شۆڕشو جیابوونەوەی ئاڵای شۆڕش بەسترا، وابزانم 63 كەس بووین، هەموومان واژۆی بڕیاری گوللەبارانكردنی مەلابەختیارمان كرد، بەڵێ منیش واژۆم كرد..بێگومان ئەمەش لەژێر گوشارو كاریگەری كاك نەوشیرواندا بوو..تەنها یەك كەس بڕیارەكەی واژۆ نەكرد، ئەویش "عەبدوڵڵا تۆفیق" بوو، گوتی من واژۆی ناكەم، چونكە

مەلا بەختیار پیاوێکی ماندووەو تێکۆشەرە، لەبەر ئەوە حەق نییە بیکوژین..بەڵام دواتر مام جەلال گوتی ئەو بڕیارەتان بە من بسپێرن من جێبەجێی دەکەم..بۆیە مام جەلال کێشەکەی کرد بەهی خۆیو مەلابەختیاری لای خۆی زیندانی کرد، ئەمەشی بۆ ئەوە بوو جێبەجێی نەکات!.

بەڵام مەلابەختیار پیاوێکی بێ وەفایە بەرامبەر "عەبدوڵڵا تۆفیق"، چونکە دەبوو تاجی ئاڵتوونی لە سەری "عەبدوڵڵا تۆفیق" بنێت، چونکە کە سەردانی خۆیوماڵەوەیان دەکەم دەبینم خۆیو منداڵەکانی زۆر بێنازنو هەمیشە هەست بەوە دەکەم کە کاك مەلا بەختیار لە بەرامبەریان چەند بێ وەفایە!.

***مام جەلال رابەری شۆڕشی نوێ بوو..هەموو دەسەلاتێکیشی هەبوو، کاتێك "مەلابەختیارو ئەوانی دیکە" بێ منەتیان بەرامبەری نیشان ئەدا..مام چ هەڵوێستێکی هەبوو؟**

-هەڵوێستی مام جەلال بەرامبەر هەموو پێشهاتەکان هاوسەنگانە بوو بەرامبەر گروپەکەی کاك بەختیارو کاك سالاریش هەر وابوو..لەلایەك مام جەلال براگەورەو رابەری شۆڕشی نوێ بوو راستە، لەلایەکی دیکەشەوە پێکهاتەی یەکێتی کە سێ باڵ بوو "کۆمەڵەی مارکسیستی توندڕەو،

خـەتی گشـتی و بزوتنـەوەی سۆسیالیسـت دیموکرات"بـوون، بۆچـوونی جیاوازیشـیان هـەبوو، بۆیـە مـام جـەلال هەمیشـە هەوڵیدەدا پارسەنگ و هاوسەنگی رابگرێت.

بـەڵێ، زۆرجـار نـاکۆکی دەکەوتـە نێـوان مـام جـەلال و ئـەو گروپـەو هەنـدێ جـار نامـەو نامـەکاری توندیشـیان لەنێوانـدا دەبوو، مام جەلال لەگەڵ کاك نەوشیروانیش ناکۆکی لێ پەیدا دەبوو، بەڵام لە ئەنجامدا هەمیشە مام جەلال پشتیوانی لە کاك نەوشـیروان دەکـرد لـە بەرامبـەر گروپەکـەی کـاك سـالارو کـاك بـەختیارو مامۆسـتا جەعفـەرو ئـەوانی دیکـە. ئـەو پارسـەنگ و هاوسـنگی راگرتنـەی مـام جـەلال بـۆ شـۆڕش و یـەکگرتووی یەکێتی زۆر گرنگ بوو.

***ئایا دوای بەربوونی مەلا بەختیار، ئالای شۆڕش هەر وەك خۆی مایەوە؟**

-بەڵێ، ئالای شۆڕش لـەدوای گرتنـی مەلابـەختیاریش هـەر بەردەام بوون و بە سەرکردایەتی کاك سالار عەزیزو کاك عیمـاد ئەحمـــەد، بارەگاکانیـــان بردنـــەوە بـــۆ دیـــوی کوردســـتانی رۆژهەڵات و لە گوندی زێویێ جـێگیر بوون..جارجـارەش بـەیان و بڵاوکراوەی توندییان دژی ئێمە دەردەکردن..

***کاتێك ئاڵای شۆڕش لە ئێران بوون هیچ پەیوەندییەکیان بە "پارتی دیموکراتی کوردستان"ەوە هەبوو؟ یان هیچ هاوکارییان لێ وەردەگرتن؟**

–بەڵێ، پەیوەندییان لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان زۆریش باش بوو..دواتریش کە کاك مەلا بەختیار لە زیندان ئازادکرا چووە ناوچەی شنۆو نەغەدە دانیشتو لەوێ لەگەڵ برادەرەکانی خۆی خەریکی رێکخستنەوەی ئالای شۆڕش بوون، بەڵام لەناوخۆیاندا ناکۆکی توندیان هەبوو، بە تایبەت لەنێوان کاك مەلابەختیارو کاك سالار عەزیزو کاك عیماد ئەحمەد..دواتر بیرۆکەی ئەوەیان لادروست بوو کە وەك رێکخراوێکی چەپی بچووك ناتوانن هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر رووداوەکان هەبێت، بۆیە بیرۆکەی ئەوە لای هەندێکیان دروست بوو کەوا بێنەوە نێو حزبی دایكو پەیوەندییان بە یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوە کردەوە.

من لەو بارەیەشەوە لەگەڵ هەندێك لە سەرکردایەتی ئالای شۆڕش پەیوەندیم دروست کردبوو، بوشمە نێوەندگیر لەنێوان ئەوانو مام جەلالو تەنانەت هەندێکیانم بە نهێنی بینیو بەسەیارەی خۆم لە ورمێو نەغەدەو شنۆوە بۆ لای مام جەلالم لە قاسمەرەش بردنو لەوێ رێککەوتنێکی نهێنی لەنێوان ئەو سەرکردانەو مام جەلال دروست بوو..دوای راپەرینیش کە گەراینەوە بۆ کوردستانی خۆمان، ئەوان بەتێکرایی بریاریاندا

بچنە نێو حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان.. بەڵام پاش ماوەیەك لەوێش نەگونجان و دواجار دوای گفتوگۆیەکی زۆرو چەند مانگە هاتنەوە نێو یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و بەرێزەوە پێشوازیان لێکرا.

***مام جەلال دەڵێ، دەستی حکومەتی عێراقی لەنێو ئاڵای شۆڕشدا هەبوو، حکومەت دەیویست لەرێگای ئەوانەوە کێشە لەناو شۆڕش و یەکێتیدا دروست بکات؟ هیچ زانیارییەکت لەو بارەیەوە هەیە؟**........"دیداری تەمەن. ل 120-121".

—من هیچ زانیارییەکەم لەسەر ئەوە نییە حکومەتی عێراقی دەستی لەناو ئاڵای شۆڕش هەبووبێت، بەڵام بەگشتی حکومەتی عێراق کاری لەسەر ئەوە دەکردو هەوڵی تێکدانی ریزەکانی نێوخۆی حزبەکان و نێوان حزبەکانیش دەدا، بۆ ئەوەی ئاژاوە دروست بکات.

بەڵام ئەوانەی لەناو ئاڵای شۆڕش بوون، پیاوی تێکۆشەرو پێشمەرگەی قارەمان بوون.. ئەوەی من بزانم تەنها لەڕووی بیروباوەڕەوە جیاوازییان لەگەڵ ئێمەدا هەبوو. ئەوان زیاتر لەژێر کاریگەری کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێراندا بوون..بەڵام ئەوەی دەستیان لەگەڵ حکومەتی عێراق هەبووبێت، هیچ زانیارییەکەم لەو بارەوە نییە.

***کێشەی تۆ لەگەڵ کاك سالار عەزیز لەسەر چی بوو، خۆ ئێوە پێشتر هاوڕێ بوونو بەرپرسیشت بووە؟**

ڕۆژێك منو پەخشان لەماڵەوە دانیشتبووین، 31-3-1980 بوو، لەپڕ کاك برایم جەلالو شێخ تاڵب بەمیوانی هاتنە لامان..هەر ئەوکات پێشمەرگەیەك خۆی کرد بەژوورداو نامەیەکی هێنابوو..تەماشام کرد نامەکە هی کاك سالار بوو. کاتێك کە من چوومە شاخ کاك سالار لەوێ نەبوو کە هاتیشەوە چوومە سەردانی بەڵام لەگەڵمدا زۆر بەلوتف نەبوو، چونکە من لەسەر کوتلەی سجن حساب بوومو ئەوانیش وایان دەزانی کوتلەی زیندان دژایەتیان ئەکەن.. بە هەرحاڵ لەنامەکەدا نووسیبووی یادی حزبی شیوعیەو پێمخۆشە خۆتو کادیرەکان بێن لە یادەکە بەشداربن..ئەو ڕۆژە پێنج شەممە بوو، بەیانییەکەی لای ئێمە پشوو بوو، کادیرەکان کەسیان لەوێ نەبوون..ئەوانەی لەوێش بوون یەکیان خەفەر بوو ئەویتریشیان جلی ئەشووشتو ئەوانی دیکەش بەملاو ئەم لادا چووبوون..خۆشم میوانم هەبوون..ڕاستی حەزیشم نەدەکرد بچم. بۆیە بەرێزەوە وەڵامی نامەکەی کاك سالارم دایەوەو بارودۆخەکەم بۆباسکردو نووسیم داوای لێبوردن ئەکەم ناتوانم بێم.. بە پێشمەرگەکەدا نامەکەم بۆ ناردەوە..پاش نیو سعاتێك کوڕەکە هاتەوەو نامەیەکی دیکەی هێنابوو..ئەوجا کاك سالار نووسیبووی تۆ ئەبێ بزانی لەگەڵ کێ قسە دەکەی و

نامە بۆ کێ ئەنووسی، من ئەتوانم هەموو شتێکت بەرامبەر بکەم، تۆ کادیرێکیو من مەکتەبی سیاسی، ئەبێ بزانی چۆن نامە ئەنووسیو چۆن لەگەڵ مندا مامەڵە دەکەی؟! منیش زۆرم پێ سەیر بوو..چونکە هیچ کێشەیەکم لەگەڵ کاک سالار شك نەدەبرد، بەپێچەوانەوە من بەپشتیوانی ئەو چووبوومە شاخ.. منیش بە کاك برایم جەلالو شێخ تاڵبم گوت برادەرینە ئێوە شاهیدبنو وەرن خۆتان بارەگا بپشکننو سەیربکەن، بزانن کەسی لێیە..ئەوە کاك سالار نامەیەکی وای بۆ من نووسیووە..بەراستی زۆر نارەحەت بووم..بەڵام من چونکە گەنج بوومو خوێنم گەرمبوو..نامەکەم وەڵامدایەوەو گوتم..تۆ خۆت وەرە سەیری بارەگا بکەو بزانە کەسی لێیەو دەتوانی لە میوانەکانیشم بپرسیت بزانە نامەکەی من راستە یان فێڵم لێکردووی..بەڵام من کادیرێکمو تۆش ئەندامی مەکتەبی سیاسی چیت لەدەست دێت قسووری مەکە..نامەکەم بۆناردەوە..دوای رۆیشتنی میوانەکان نامەکەم هەڵگرتوو چوومە لای کاك نەوشیروان..گوتم ئێمە میوانینو ئەوان وا مامەڵەمان لەگەڵ دەکەن..دەشمزانی کاك نەوشیروان لەگەڵ کاك سالارو ئەوان ناکۆکە..کاك نەوشیروان گوتی گوێیان پێ مەدە. ئیتر تا ماوەی یەك دوو مانگ بەینمان لەگەڵ کاك سالار نەما، لەپڕ رۆژێك کاك سالارو کاك مەلابەختیار هاتنە ماڵەوە،

مەلابەختیار گوتی: کاك سالار برای خۆتەو ئەندامی مەکتەبی سیاسیەو لەتۆ گەورەترە..تاد..گوتم وەڵامی کاتیَ من هاتمە نێو شۆڕش یەکێك لەپشتوانەکانم کاك سالار بووەو تێکەڵاویمان هەبووەو بەرپرسیشم بووەو لەماڵیان خەوتوومو نمەکم کردوون..دەبوایە تۆ لەگەڵ کاك سالار بێیو کاك سالار لەگەڵ تۆم ئاشتبکاتەوە، نەك پێچەوانەکەی.. بەهەرحاڵ بەوشێوەیە هیچمان لەبەین نەما. ئێستاش کاك سالار هەر براگەورەیە.

## خەباتی سیاسیو
## پەیوەندی د.ئەرسەلان بایز بە جەنابی مام جەلال

***بۆ یەکەمین جار مام جەلالت ڕووبەڕوو کەیو لەکویَ بینی؟**

–بۆ یەکەمین جار من مام جەلالم لەبەغداد بینی، ئەو کاتە من لەقۆناغی یەکەمی بەشی کوردی زانکۆی بەغداد بووم، کادیرێکی باڵی مەکتەبی سیاسی، پارتی دیموکراتی کوردستان بووم"جەلالی بووم".

مام جەلال، خولێکی کادیرانی بۆ کادیرانی زانکۆ کردبووەو منیش تێیدا بەشدار بووم، خولەکە لەژوورێکی گەورەو لە

شەقامی فەلەستین کرابوەوە، بۆ وانە وەرگرتن دەچووینە ئەوێو مام جەلالیش هەفتانە دوو، سێ ڕۆژ دەهاتو سعاتێك، دوو سعات قسەی بۆ دەکردین..باسی کتێبەکەیو سیاسەتی بۆ دەکردین، هەروەها باسی کتێبەکەی "ماو سیتۆنگ" "چینەکانی کۆمەڵگا"ی بۆ دەکردین، ئەو کات کتێبێکی بەناوی "الجبهة الدیمقراطیة المتحدة" دەرکردبوو، لەدوا ڕۆژەکانی خولەکەشدا بیرمە کتێبەکەی مام جەلالیان بۆ هێناین، هەمووی وەرقە بوو.. بە هەموومان کۆمانکردەوەو دەرزیمان لێیداو کردمانە کتێب، ئێمە هەر پانزە بیست کەسێك دەبووین، بەچەند سعاتێك کارەکەمان ئەنجامداو دواتریش یەکەو دانەیەك لە کتێبەکەیان پێداین، ئەمە سەرەتای بینینو ناسینی من بوو لەگەڵ مام جەلال.

***بۆچی کارکردنت لەگەڵ مام جەلال هەڵبژارد، لەبەر ئەوە بوو گرنگی زیاتری پێدەدایت؟**

–دوای پەیوەندیکرنم بەشۆڕشو پێشمەرگەوە لە مانگی 12ی ساڵی 1979، کە گەیشتمە ئەوێ مام جەلال لەسەفەر بوو، ئەو نامەیەی پێم بوو بۆ کاك نەوشیروانم برد.. دوای ئەوەی مام جەلال گەڕایەوە، چوومە سەردانی. مام جەلالیش بەهۆی چوونی منەوە میوانداریيەکی بۆ ڕێکخستینو زۆربەی برادەرانی کوتلەی زیندانیشی بانگ کردبوو.. ئەوان پێش من

پەیوەندییان کردبوو..لەو رۆژەوە پەیوەندیم لەگەڵ مام جەلال دروست بوو..بەپێی رۆژگار سەیرم کرد، لە مامەڵەکردن لەگەڵمدا مام جەلال کەسێکی سیاسیترو دبلۆماسی ترو قسە خۆشتر بوو.

## شەڕی براکوژی لەشاخو لێکەوتەکانی

***شەڕی قرناقەو پشتئاشانو لێکەوتەکانی ئەزانیت؟! ئایا توندی ئەو شەڕە وەك تۆڵەکردنەوەی کاك نەوشیروان بوو بەرامبەر بە گرتنەکەیو دواتر هاتنەوەی؟**

-شەڕی قرناقەو پشتئاشان، ئەوەی من ئاگام لێی بێت لە ئەنجامی کەڵەکەبوونی چەندین هۆکاربوو، لەوانە شەهیدکردنی" سەربازو شەماڵ" لەلایەن حزبی شیوعی لەناوچەی "باداوان"ی بناری شاخی کۆسرەت، بوو بە هۆی تەقینەوەی رووداوەکە. " شەماڵو سەرباز"و چەند پێشمەرگەیەك شەهید بوون.."شەماڵو سەرباز" زۆر لای مام جەلالو کاك نەوشیروان خۆشەویست بوون.

بۆیە بڕیار لەسەر ئەو رووداوە درا، بڕیارەکە وا بوو لە جیاتی ئەوەی هێز بنێرینە خوارەوەو چەند پێشمەرگەیەکی

کوڕی هەزار بکوژرێن، با پەلاماری سەری حزبی شیوعیو بەرەی جود بدەین.. ئەوە بوو هێزێکی زۆر گەورە بۆ سەریان کۆکرایەوە.. ئەو کاتە بارەگای ناوەندی راگەیاندن لە "سەرشیو"بوو کە دەکەوێتە نزیك گوندی "گەناوی" سەر زێی بچووكو پشتی قەلآدزێ.. ئەو شەڕە لە ئەنجامی هەندێ قونەشەڕو شەهیدبوونی پێشمەرگە لەو شەڕانەدا بوو لەنێوان یەکێتیو حزبی شیوعیو پارتیو سۆسیالیست، دواجار شەڕەکە بەو شێوە گەورەو قورسە قەوما.. بەداخەوە لەو شەڕەدا ژمارەیەکی زۆری خەڵك بریندار بوونو کوژرانو بەدیل گیران، لەوانەش مامۆستا کەریم ئەحمەدو ئەحمەد بانی خێلآنی کە ئەو کات سکرتێری حزبی شیوعی بوو گیرانو بەرەی جود تێکشکا..شەڕەکەش بەسەرکردایەتیو فەرماندەیی کاك نەوشیروان بوو.

***کەی بوو کاك نەوشیروان لەلایەن سۆسیالیستەوە گیرا، ئایا هەڵات یان بەنامەی مام جەلال ئازادیان کرد؟**

-گیرانی کاك نەوشیروان ئەوەی من بیستبێمو ئەوکاتەی لەسەرکردایەتی بووم، کاك نەشیروان پیاوێکی خاکی بوو، زۆریش نەدەهاتە کۆبوونەوەکانی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتیو لەگەڵ هەندێ لە سیاسەتەکانی مام جەلالیش ناکۆكو نارحەت بوو، زۆرجاریش لە کۆبوونەوەکان دەمەدەم لەنێوانیان دروست دەبوو.. لێکتر توڕە دەبوونو کاك

نەوشـیروان جـاری وا هـەبوو بـۆ چـەندین مـانگ نەدەهاتـەوە کۆبوونەوەکانی مەکتەبی سیاسی.

ڕۆژێکیـان کـاك نەوشـیروان خـۆیو دوو سـێ پێشـمەرگە بەجەولـە دەچـنە ناوچـەی شـارەزوور، بـۆ ئـەوەی سـەردانی کەسـوکاری بکـات.. ئەگەرچـی مـن پێموایـە کـاك نەوشـیروان هـەرگیز لەخـەمی کەسـوکارو دایـكو بینینـی خـزمو براکـانی نـەبووە، بـەلام نـازانم بـۆ چـوو بـوو.. وا بلاوبـوەوە کـە بـۆ سەردانی کەسوکاری چووە !. ئەوساش ئێمە ناکۆکیمان لەگەڵ سۆسیالیسـت هـەبوو، حزبـی سۆسیالیسـت لـەو ناوچـەیەدا هێزێکـی گـەورەو شـەڕکەری هـەبوو، کاتێـك زانیبوویـان کـاك نەوشـیروان بـە تـەنهاو لەگـەڵ یـەك دوو پێشـمەرگە لـەو ناوچەیەیە، چووبوون دەوریان دابوو، کاك نەوشیروانیان بەدیل گرتبـوو.. ماوەیـەکی بـاش کـاك نەوشـیروان لـەوێ مایـەوەو لەهەموو لایەکەوە هەوڵ دەدرا تـاوەکو ئـازاد بکرێت..تەنانـەت هێزێکـی گـەورەی یـەکێتی نیشـمانی کوردسـتان چـووە ئـەو ناوچەیەی کـاك نەوشـێروانی لێگیرابـوو.. بـۆ ئـەوەی دەرفـەت بێـننو پـەلاماری حزبـی سۆسیالیسـت بـدەنو رزگـاری بکـەن، بەلام باشبوو بەخێر شکایەوەو شەڕەکە ڕووی نەدا.

کۆمەڵێك کەسیش ڕۆڵیان لە دەرفەت رەخساندن هـەبوو بـۆ ئەوەی کاك نەوشیروان رابکـات، لەوانـە "کـاك حەمـەی حـاجی مەحمودو شـێخ کـاوەو شـێخ دارای حەفیـدی بـرای پەخشـانی

خێزانمو نالەی حەفیدی شاعیرو شێخ مەنصوری حەفیدیش کە ئەوکات یەکێك بوو لە فەرماندەکانی سۆسیالیست". هەتا دێتەوە بیرم، کاتێك کاك نەوشیروان هاتەوە، منو پەخشانی خێزانم لەتوژەڵەوە بەپێیان چووینە بارەگای کاك نەوشیروان بۆ بەخێرهاتنەوەی، بەلام لەماڵەکەی نەبوو.. دواتر ئێمە چووینە دیوی گوندی "زەڵێ" لەرێگا توشی کاك نەوشیروان بووین.. هەر لە دوورەوە کاك نەوشیروان بانگی پەخشانی کردو گوتی: پەخشان من تاوەکو ماوم قەرزاری بنەماڵەی ئێوەم..چونکە زۆر هاوکارم بوون تاوەکو رزگارم بکەن.. بەلام بەداخەوە کاك نەوشیروان زۆری نەبردو دوای مانگێك، مانگو نیوێك لە ئەنجامی هەڵەیەکی "شێخ کاوەی حەفید" کەوتە جنێودان بە کەسوکاری پەخشانو بنەماڵەی حەفید.

بەلام ئایا کاك نەوشیروان رایکرد، یان ئازادییان کرد من پێموایە کۆمەڵێك خەڵك کارئاسانیان بۆ کرد تاوەکو رابکات!.

***

## بەرەی کوردستان و راگەیاندنی هاوبەش

***دوای دروست بوونی بەرەی کوردستانی، کرای بە بەرپرسی راگەیاندنی "بەرە"، دانانەکەتان بەرێکەوت بوو، ئایا نوێنەری حزبەکانت بیر ماون کێ بوون؟**

–من لە خەباتی شاخ و شۆڕش و پێشمەرگایەتیدا هەشت سالْ لێپرسراوی مەکتەبی راگەیاندنی "ی.ن.ك" بووم، ئەوسا مانگنامەی رێبازی نوێ و "شەراڕە" هەبوون، راستی من هیچ پەیوەندییەکم بە شەڕارەوە نەبوو، کاك یوسف و کاك فەرید ئەسەسەردو کاك ئازاد چالاك و کۆمەڵێك برادەری دیکە ئەو ئەرکەیان رادەپەڕاند، بەلاّم خۆم سەرپەرشتی رێبازی نوێم ئەکردو بەشێکی زۆری سەروتارەکانیشم ئەنووسین، برادەرانیش هاوکاریان ئەکردین. رادیۆشمان هەبوو، بەهەمان شێوە وتارە سیاسییەکانی رادیۆش بەشی زۆری خۆم ئەمنوسین. راستی رادیۆکەمان بۆ ئەوکات وەك ئاگر وابوو.. زۆر کاریگەربوو، جیا لەسالّی یەکەم و دووەمی بەرپرسیارێتیم لەو دەزگایە هەر لەسەرەتاوە پەیوەندیم لەگەلْ مام جەلال هەبوو، یەکێتی خۆی لەچەند بالّێك پێك هاتبوو، من لە کوتلەی مام جەلال بووم..ئەگەرچی مام جەلال وەك برا گەورە هەلّسوکەوتی لەگەلْ هەموو لایەك دەکرد، بەلاّم من

هەڵسـکەوت و مامەڵـەکردنی مـام جـەلالم پێخۆشـتربوو، کـاك نەوشیروانیش ئەمەی پێ ناخۆش بوو! کـادیرانی کۆمەڵـەش وا پـەروەردە دەکـران کـە لەگـەڵ یـەکێتی شۆڕشـگێڕان و خـەتی گشتی تەبا نەبن، جارجـارەش برادەرانـی کۆمەڵـە لەگـەڵ مـام جەلالیش تەبا نەدەبوون..

کاك نەوشیروان دەیویست لەو نزیکتر بم، منیش وانـەبووم.. بۆیە هەمیشە هەوڵی لادانی منی لە دەزگای ڕاگەیاندنی شۆڕش دەدا.. تا دوای ئەنفالـەکان کـە پاشەکشـەمان بۆ ئێـران کـرد، ڕۆژێکیان مام جـەلال لـەدەرەوەی وڵات بـوو، کـاك نەوشـیروان دەرفەتـی هێناو منی لەدەزگای ڕاگەیاندن لابردو کاك فەرەیدون عەبـدولقادری لـەجێی مـن دانـاو دواتـر منـی کـردە نوێنـەری یـەکێتی لـە ڕاگەیانـدنی بـەرەی کوردسـتانی، سـەرەتا بـانگی کـردم و دڵنـەوایی کـردم و گـوتی ئـەو شـوێنە ئێسـتا گرنگـەو پێویسـتی بـەتۆ هەیـە.. گـوتم مـن خـۆم ئـارەزووی ئـەو کـارە ناکـەم، بـەڵام کـە بڕیـاری یـەکێتی و سـەرکردایەتی ئـەوە بێـت ئاساییە.. من خۆم دڵنیا بووم کـە مەبەسـتی دوورخسـتنەوەی من بوو، نەفی کـردن و وەرگرتنـەوەی دەزگـای ڕاگەیانـدن بـوو لەمن. دوای ئەوەی ماڵ و منـاڵم بـرد بـۆ ئـەوێ و جـێگیر بـووم، دوای چەند ڕۆژێك هاتمەوە لای کاك نەوشـیروان..لێی پرسـیم.. گـوتی بــەرەی کوردســتانی چــۆنەو دەزگــای ڕاگەیاندنەکــەی چۆنە..نازانم قسەکەی خۆی بیر چووبوەوە یان بـە مەبەسـت و دڵشکاندنی من بوو.. گوتی توخوا ئـەوە دەزگایـەکی کـارتۆنی

نییە ! ؟ گوتم بەڵێ وایە، جاری پێشوتریش پێم گوتبووی ئەو دەزگایە شتێکی گرنگ نییە، بەڵام من تازە چوومەتە ئەوێو رازیم.

کە لە راگەیاندنی بەرەی کوردستانی دەست بەکاربووم، پێشتر کاك فەلەکەددین کاکەیی رەحمەتی سەرپەرشتی دەکرد.. بەڵام کاتێك من چووم ئەو کشایەوەو گوتی کە تۆ هاتووی دەزگاکە تەسلیمی تۆ دەکەم.. ئەوانەی لەبیرم بن لەبرادەرانی پارتی بارزانی مەلاخالید لەوێ بوو، لە حزبی شیوعیش "هۆگر" ناوێك کە بەداخەوە لە رێگای رووسیا بێسەروشوێن بوو. نوێنەری حزبەکانی تریشی لێبوونو هەمووومان توانیمان بەیەکەوە بگونجێینو دەزگایەکی باشی راگەیاند بەرێوە ببەین.. مانگنامەی "بەرەی کوردستانی"یشمان بە تیراژی "300" دانە چاپ دەکردو خەڵك زۆر کۆپیان لەبەر دەگرتەوەو تیراژەکەی بۆ "1000 تا 2000" دانە دەرۆیشت.

***بەڵام دواتر لەو شوێنە لابرایو لەسەرکردایەتیش تەجمید کرای.. هۆکارەکەی چی بوو؟**

-من لە مانگنامەی "بەرەی کوردستانی" گۆشەیەکم بەناوی"خەرمانە" هەبوو، نوسینی رەخنەییم تێدا بڵاودەکردەوەو رەخنەم لەسەرکردایەتی هەموو حزبەکان دەگرت، بەتایبەت حزبەکەی خۆم کە دەرەقەتی دەهاتم.

دواجار کاك نەوشیروان لەسەر رەخنەو نوسینەکانی ئەو گۆشەیەم تەجمیدی کردمو لەویێ لایبردمو مانگنامەکەشی بۆ ماوەی شەش مانگ داخست. هەر بەوەش نەوەستا بروسکەیەکیشی بۆ مەکتەبی سیاسی هەموو حزبەکان کردو پێی راگەیاندن کە "ئەرسەلان بایز" نوێنەری ئێمە نییە. هەموو ئەمەش لە ئەنجامی وتارێکی کاك "عەلی بچکۆلّ" روویدا.. لە راستیدا "ئێستا" سەد هێندەی ئەوکات رەخنە دەنوسرێو قسەی توند دەکرێن، بەتایبەتی "گۆڕان" کە کاك نەوشیروان دایمەزراند، لە سنووری رەخنەشیان تێپەڕاندووە، بەڵام دیارە ئەوسا وا نەبوو.. برادەران رەخنەیان پێ قبولّ نەدەکرا.

کاتێکیش مانگنامەکە داخراو منیش دورخرامەوە، کاك فەرەنسۆ حەریری رەحمەتی کە ئەوسا ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، لە کۆبوونەوەیەکدا بانگی کردمو گوتی ئێمە قسە لەگەڵ کاك مەسعود بارزانی دەکەین تاوەکو قسە لەگەڵ کاك نەوشیروان بکات..بەڵام من گوتم..نا سوپاست دەکەم.. من داوا لە کەس ناکەمو پابەندی بڕیاری حزبەکەی خۆم دەبمو دەڕۆمەوە ماڵەوەو لەڕای خۆم پەشیمان نابمەوە. ئەوەبوو دوایی ئەبو حیکمەت لە یاداشتەکانی خۆیدا بە دورودرێژی باسی لەو رووداوە کرد.

# پەیوەندییەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان
# بە حکومەتی عێراقەوە

***ئایا هیچ جار لەرێگەی موخابەراتی عێراقەیەوە سەردانی بەغدادت کردووە، بۆچ مەبەستێك بوو، ئایا ئەوکات ئەو جۆرە پەیوەندییانە لەگەڵ بەغداد هەبوون؟ کێ بوون ئەوانەی لەکوردستان ئەو پەیوەندییەیان هەبوو؟**

–لەکاتی دانوستانەکانی ناوەڕاستی هەشتاکان، ئیتر جارجارە پەیوەندییەك لەنێوان یەکێتیو حکومەتی عێراقی بەپەیامێك، یان نامەیەك، یان راسپاردەو بروسکەیەك هەر دەبوو، تا شەڕی ناوخۆ هاتەپێشەوەو حکومەتی عێراقی هاتەوە ناو شاری هەولێر ئەو پەیوەندییە هەر مابوو..

رۆژێك مام جەلال بانگی کردم..گوتی شتێکم بەدەستەوەیە..دەمەوێ تۆ ببی بە بەرپرسی یەکێك لەبەرەکانی شەڕی ناوخۆ، منیش گوتم مام جەلال کەست نەدۆزییەوە من نەبێت، خۆ من لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بۆ رۆژێکیش پێشمەرگەی شەرکەڕ نەبووم.. چ جای سەرپەرشتی بەرەیەکی شەڕ! من هەمیشە کاری راگەیاندنم لە تۆژەڵەو

بەرگەلو کردووە.. گوتی دەك داوەشێی لەخۆت رانابینی قیادەی جەبهەیەك بکەی و ئەندامی سەرکردایەتیشی.. گوتم بەهەرحاڵ من لێی نازانم بەڵام جەنابت چ ئەمر دەکەی.. جێبەجێی دەکەم.

چوومەوە ماڵ و خۆم ئامادەکردو چوومە بەرەی شەڕەکە..بەڵام خۆی شێخ جەعفەری وەك یاریدەدەری من دانابوو، دوای گەیشتنم بە چەند سعاتێك بروسکەیەکی ناردبوو، دەڵێ جەبهەکە رادەستی شێخ جەعفەر بکەو خۆت بگەڕێوە کارم پێتە، کە گەڕامەوەو چوومە لای، مام جەلال گوتی وەرە برۆ بۆ بەغداد، هەندێ شتی بەمن راسپارد..

ئیتر لە بانی مەقانی لای چەمچەماڵ..هەواڵگری عێراقی منیان وەرگرت و لەسەیارەی خۆیان سواریان کردین، تەنها من و موقەدەم دارای تۆفیق ئاغا بووین، تۆفیق ئاغای سلێمانی. بۆ مێژوو لەرێگا کاك دارا وتی ئەرسەلان تۆ نوێنەری مام جەلال و میللەتێکی، بۆیە ئەبێ زۆر وردو بێ منەت بیت لە وەڵامدانەوە، دیاربوو "موقەدەم دارا" بەهۆی رابردووی لەسوپای عێراق و راسپاردەی مام جەلال پەیوەندیەکی لەگەڵ موخابەراتی عێراق هەبوو، ئەفسەرەکانی هەموو دەناسین..چونکە خۆی پێشتر لە موخابەرات بوو. لەوێ چووینە کەرکوك و لەوێشەوە بۆ بەغداد.. بەدرێژایی ئەو سەفەرەو چەندین سەفەری دیکەش کە من وەك نوێنەری مام

جەلال بە مەبەستی گفتوگۆکردن لەبارەی هەندێ شتی تایبەت دەچوومە بەغداد، لەو سەفەرانەدا هەر کە منیان لە بانی مەقان وەردەگرتو دەچوومو دەهاتمەوەو چەند شەوێك لەوێ دەبووم، نوکتەکانی هەوالگری عێراقی لەسەر "شێخ زاید" بوون، دەیانگوت پیاوێکی خێلەکیو نەزانو نەخوێندوارە..دوای بەچکە حوشتر کەوتووەو بەشانو بالی سەدامو حکومەتەکەشیان هەلدەدا، دەیانگوت سەدام رۆشنبیرەو دەرچووی زانکۆییە، بەلام بۆ هەموو لایەك دەرکەوت کە شێخ زاید چی بۆ شانشینی عەرەبی کردو توانی هەر "7" میرنیشنەکە ئەگەرچی لەیەکتریش جیاواز بوون، رێك بخاتو ئێستا ئیماراتی عەرەبی یەکێکە لە پێشکەوتووترین ولاتەکانی دنیاو دوبەیش یەکێکە لەشارە جوانو گەشتیارییەکانی دنیا. سەدامیش چی بەسەرهاتو چیشی بەسەر میللەتانی عێراق هێنا. ئەنفالو کیمیابارانو لەسێدارەدانی پێشکەش کردن، تا ئەو رادەیەی کە خۆیو خێزانەکەشی تیا چوون.

***ئەی نامەکەی "عیزەت دووری" چی تێدابوو کە بۆت برد..بۆچی لە نامەکەی مام جەلال تورە بوو؟**

–یەکێك لەجارەکان مام جەلال گوتی لەگەل موقەدەم دارا برۆنە بەغدادو ئەو نامەیەم بدەنە "عیزەت دووری". کاتێك نامەکەم بەداخراوی وەرگرت، من پێم شەرم بوو لەمام جەلال

بپرسم نامەکە لەبارەی چیەو چیی تێدا نوسراوە..چونکە مام جەلال نوستبوو. منو مقدەم دارا نامەکەمان بردە بەغدادو دامانە دەست عیزەت دووری.. کە نامەکەی کردەوەو خوێندییەوە، دەموچاوی گرژبوو، رووی کردە منو گوتی ئەوە مام جەلال بۆ نازانێ نامە بنوسێت! ؟ منیش پێکەنیمو گوتم نازانم نامەکە چی تێدا نوسراوە، چونکە نامەکە لەنێوان دوو برادەرە..تۆ لە کۆنەوە مام جەلال دەناسی.. بەڵام باوەڕ ناکەم مام جەلال نەزانێت نامە بنوسێت، چونکە مام جەلال عەرەبی زانێکی بێهاوتایەو کەسێکی سیاسیە، منیشی بۆ دۆستایەتی ناردۆتە ئێرە..گوتی نا..من نیگەرانم لەو نامەیەی مام جەلال..

دوای گەڕانەوەم بۆ لای مام جەلال، گوتم مام جەلال عزەت دووری نیگەران بوو، نامەکە چی تێدابوو..گوتی لەوانەیە پەیامەکەم نەگەیشتبێت..دەنا شیعرێکی جەواهیریم بۆ نوسیبوو..لەوانەیە لە شیعرەکە نەگەیشتبێت. دوای ماوەیەک تێگەیشتین کە عیزەت دووری لە دێرە شیعرەکەی جەواهیری نەگەیشتبوو.

مامجەلال کەسێکی شارەزاو پسپۆڕی شیعری جەواهیری بوو، گەلێ جاریش لە کۆبوونەوەکانی لوتکەی عەرەبی، زمانی عەرەبی بۆ سەرۆکی ولآتانی عەرەبی راست دەکردەوە..تەنانەت جارێکیان "حوسنی موبارەک"ی سەرۆکی میسر لەبەرچاوی هەموو سەرکردەکانی عەرەبی

گوتی، وەڵڵا زۆرم پێخۆشە کەسێکی کوردی عێراقی بێتو وتارەکانی کۆتایی لوتکەی عەرەبیمان بۆ راستو دروست بکاتەوە.

*** لەیەکێك لەدیدارەکانتان لەگەڵ "تەها جزراوی" لێك گیردەبنو قسەکانتان دژ بەیەك دەبێت، هۆکارەکەی چی بوو؟**

– لە سەردەمی شەڕی ناوخۆ، چ ئێمەو چ پارتی جارجار بە تەنها دەچووینە بەغداد بۆ ئەوەی لەدوای 31ی ئاب لەکێشەکانی نێوانماندا بەغداد بێ لایەن بکەینو پەلامارمان نەداتەوە..یەکێك لەجارەکان منیان بردە لای "تەها جزراوی" لەوێ قسەمان کردو باسی کێشەی کورد کرا.. ئەو گوتی هاولاتیەکانی ئێمەی کوردو ئێمە نوێنەرایەتی کورد ئەکەین..

منیش وەڵامدایەوەو گوتم، وانییە ئەوەی نوێنەرایەتی کورد دەکات حکومەتو پەرلەمانەکەیەتی کە ئێستا بوونیان هەیەو دانتان پێناوەو پێشتریش حکومەتی عێراق دانی بەناوچەی ئۆتۆنۆمی ناوە، بۆیە ئێستا حکومەتو پەرلەمانی کوردستان نوێنەرایەتی کورد دەکەن..هەر کە ئەو قسەیەم کرد دەموچاوی تێك چوو، بەمجۆرە دانیشتنەکە کەمی خایاندو یەکسەر کۆبوونەوەکە تەواو بوو.

# پەیوەندی د.ئەرسەلان بایزو د. بەرهەم ئەحمەد ساڵح

***کەی"د.بەرهەم ئەحمەد ساڵح" تان ناسی؟**

- بەڵێ، یەکەمجار کاك د. بەرهەمم لە کۆنگرەی یەکەمی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە سلێمانی بینی..لە کۆنگرەکەدا نوێنەری زۆرێك لە حزبو وڵاتان هاتبوونو وتاریان خوێندەوە.. د. بەرهەم کوڕێکی گەنجی باڵا بەرزی..نیوە سەر روتاوە بوو..کاری وەرگێڕانی بۆ میوانە بیانیەکان دەکردو وتارەکانی وەردەگێڕان.. ئەوساش ئێمە تازە لەشاخ هاتبووینەوە..زمان زانمان زۆر کەم بوون، ئەو برادەرانەی دەرەوەشمان کە ئینگلیزیو ئەڵمانیو فەرەنسیان دەزانی، هێشتا نەهاتبوونەوە.. بۆیە هەموومان کە د.بەرهەممان وا بینی.. گوتمان وەڵڵا ئەوە ئەندامی سەرکردایەتی ئەمجارەی کۆنگرەیە..قسەکەش وا دەرچوو، بووە سەرکردایەتی.

جارێکیتر ئەو کاتەی د. بەرهەم نوێنەری "ی.ن.ك" بوو لە ئەمریکا، لەساڵی 1999 شاندێکی"ی.ن.ك" بەسەرپەرشتی "د. کەمال فوئاد"ی رەحمەتیو ئەندامێتی کاك عومەری سەید عەلیو بەندە لەسەر داوای وەزیری دەرەوە "مادلین ئۆلبرایت"

چوینە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا. سەردانەکە بۆ ئەوە بوو ئێمەو پارتی ئاشتبکەنەوەو کۆتایی بە شەڕی ناوخۆ بهێنین.

لەوێوە لە نزیکەوە د.بەرهەمم ناسی، منو کاك عومەری سەید عەلی نزیکەی مانگێك لەماڵی د.بەرهەم ماینەوە، لێرەوە سوپاسی "سەرباخ خان"ی خێزانی دەکەم کە ئەو ماوەیە وەك خوشکێك زۆر خزمەتی کردین. بەڵام د.کەمال فوئاد لە هوتێل دەمایەوە. لەو مانگەدا لەوە تێگەیشتم کە بەرهەم توانایەکی زۆری هەیە"عەرەبیو ئینگلیزی"یەکی تەواوی دەزانیو کەسێکی هەڵسوڕاوو لەبلەبانو قسە حازربوو. دوای هاتنەوەشمان پەیوەندیم لەگەڵ د.بەرهەم هەر هەبوو.

***ئەی کە "د.بەرهەم ساڵح" برادەرت بوو، بۆچی دژی ئەوەبوویت ببێتە سەرۆکی حکومەتی هەرێم-ئیدارەی سلێمانی؟**

-لە ئەنجامی ململانێی ناوخۆ، ڕۆژێکیان مام جەلال بانگی کردم، لەدوای ئەوەی بڕیاریاندا کاك کۆسرەت دوای هەشت ساڵ لە سەرۆکی حکومەتی هەرێم-سلێمانی لابەنو گۆڕانکاری لە حکومەت بکەن..

گوتی: لە نێوان "عومەر فەتاحو د. بەرهەم" کێت پێ باشە بیکەینە سەرۆکی حکومەت لەجێی کاك کۆسرەت..من بێ دوو دڵی گوتم کاك عومەر فەتاحم پێ باشە..گوتی بۆ؟

گوتم: راستە بەرهەم بەتوانایەو چالاکەو گەنجە، بەلام بەرهەم لە ئەمریکا بووەو پێشمەرگە نەبوەو ماوەیەکی زۆرە لەخەلكو کوردستان دابڕاوەو وەك ئێمە شارەزای کلتووری میللەتەکە نییە.. گوتم سەرەتا بیکە شتێكو بیهێنەوە کوردستان تا شارەزا دەبێت. بۆیە من کاك عومەر فەتاحم پێباشە..چونکە ئەندازیارەو کاری ئیداری لە حکومەت کردووەو لە کوردستان دانەبڕاوەو پێشمەرگەش بووە؟! مام جەلال گوتی ..نا. زۆر باسی بەرهەمی کردوو..مەدحی کرد.

گوتی: لە دوای خۆم ئایندەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، بەرهەمە!. دیسان گوتی تۆ لە تۆنی بلێر زیرەکتری..گوتم ناوەڵڵا..گوتی دەی تونی بلێر دەڵێ هەموو شەش مانگ جارێك بەرهەمم بۆ بنێرە بۆ ئەوەی لەبارەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست راوێژی لەگەڵ بکەم.

کاتێك کە مام جەلال بەرهەمی هێنایەوەو کردیە سەرۆکی حکومەتی هەرێم..منی لەبەرچاو بوو، هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسیشی دەدیتنو هەموومانیشی هەڵسەنگاندبوو..خێربوو بەرهەمی هێنایەوە!؟ دیارە مام جەلال دەیزانی بەرهەم توانایەکی چاکی هەیەو ئایندەیەکی بۆ کوردستانو یەکێتی هەیە.

***بەڵام بیستومە تۆ جارێکی تریش دژی د. بەرهەم بوویت، تا ببێتە جێگری سکرتێری گشتی..ئەمەیان چۆن بوو؟**

– لەدوای جیابوونەوەی کاک نەوشیروان و دروستبوونی بزوتنەوەی گۆڕان..دیسان مام جەلال بەهۆی ئەوەی من بەرپرسی مەکتەبی ڕێکخستن بووم بانگی کردم، مام جەلال هەمیشە براگەورەم بووە سەد نوور لە گۆڕەکەی بێت، لە زۆر شتی ناوخۆی یەکێتی و وڵات راوێژی لەگەڵ دەکردم.. بەڵام مەرجیش نەبوو بەقسەی من بکات..گوتی دەمەوێ جێگری سکرتێری گشتی بۆ خۆم دابنێم..گوتم بۆخاتری ئەو خوایە لەدوای رۆیشتنی کاک نەوشیروان کەسی ترمان بۆدامەنێ..دەترسم وەك کاك نەوشیروان غەدرمان لێ بکەن..گوتی لەهیچ شوێنێ قسە مەکە! دوای دوو رۆژ فەرمانێکی بۆ ناردمو د.بەرهەم ساڵحی کردبووە جێگری دووەمی سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان.

***بەڵام لە کۆنگرەی سێیەمدا، ئەمجارەیان گوایە تۆ دەستت هەبوو لەوەی "کاك کۆسرەت و د.بەرهەم" بە تەزکیە بکرێنە جێگری سکرتێری گشتی، ئەمە راستە؟**

– لە کۆنگرەی سێیەمیش ململانێ لەنێوان برادەرانی کاك کۆسرەت لەگەڵ خەتی مام جەلال توندبوو، کاك کۆسرەت داوای زۆر شتو پۆستی دەکردو مام جەلالیش بەداواکارییەکانی رازی نەبوو. رۆژێك کاك "ئیسماعیل

مەحمود" هاتە لامو گوتی کاك ئەرسەلان ئەگەر فریا نەکەوی لەوانەیە بردەرانی کاك کۆسرەت لە کۆنگرە بچنە دەرەوەو کۆنگرەکە تووشی کێشە بێت..گوتم چی بکەم.. گوتی لەگەڵ مام جەلال قسە بکە لە کۆنگرە کاك کۆسرەتو کاك د.بەرهەم بکا بەجێگری سکرتێری گشتی. گوتم ئەمە قورسە بەڵام پێی دەڵێم.

ڕۆژێك کە لەکۆنگرە دەچووینەوە..گوتم مام جەلال هەندێ ئیشم پێتە، لەگەڵ مام جەلال سواری سەیارە بوومو چوینەوە ماڵەکەی..لەوێ پێم گوت وایان پێ گوتووم.. بۆ ئەوەی کۆنگرەکە بەسەرکەوتوویی بڕوات هەر لەناو کۆنگرە ئەو دووانە بکە بە جێگری خۆت..ئەوە بوو مام جەلال پێشنیازەکەی لەناو هۆڵی کۆنگرە خستەڕوو، تەنها "هێرۆخانو شانازخانو کافیەخان" ناڕەزاییان دەربڕی.

بەڵام ئەو کاتەی من لەگەڵ مام جەلال لەماڵەکەی خۆی قسەم لەگەڵ دەکرد، هێرۆخانو کاك عیماد ئەحمەد هاتن کە ئەوەیان بیستو مام جەلال لەگەڵی باسکردن، هێرۆخان گڕی گرتو کاك عیمادیش ناڕازیی بوو..هێرۆخان دەیووت ئەبێ هەموو کەس بچێتە پرۆسەی هەڵبژاردن، ئیتر ساردیەکە لەنێوان منو هێرۆخان دروست بوو، تەنانەت هەڕەشەی لێکردم کە لەسەرم ناچێ! ئەوکات کاك عیماد زۆر زۆر لە هێرۆخان نزیك بوو. سەرەنجام لە کۆنگرە من زەرەرمەند بوومو

تەکەتولەکەی کاك کۆسرەتو تەکەتولەکەی هێرۆخان دەنگیان پێنەدام، واتە لەهەردوو دین بووم.

***هێرۆخان تەنها لەسەر دانانی کاك بەرهەم ناڕازیی بوو، یان هەردووکیان، مەبەستم دانانی "کاك کۆسرەت"یشە؟**

-کێشەکە لەسەر هەردووکیان بوو، کێشەیەك لەنێوان ماڵی مامۆستا برایم ئەحمەدو د.بەرهەم هەبوو..بەتایبەت لەنێوان کاك بەرهەم لەگەڵ کاك حەمە سابیرو هەتاو خانو کێشەکە لە ئەمریکا دروست ببوو.

بافڵی کوڕی مام جەلال شاهیدە ئەو کاتیش من کەوتمە نێوانیان تاوەکو کێشەکە چارەسەر ببێت. لەو کێشەیەی لە نێوان د.بەرهەمو ماڵی مامۆستا برایم ئەحمەدو حەمەسابیرو د. لەتیف دروستبوو، مام جەلال زۆر پشتیوانی لە د.بەرهەم دەکرد.. تەنانەت ئەو نامانەی بۆ ئەملاو ئەولا دەینوسین بەمنی نیشان دەدان، بەڵام ڕۆژێك بە ئامادەبوونی پافڵ، بە مام جەلالم گوت ئەگەر بکرێت جەنابت بەشێوەیەك ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکەی..بەڵام کێشەکە چارەسەر نەکراو تا ئێستاش هەر بەردەوامە. کێشەی کوتلەی کاك کۆسرەتو خەتی مام جەلالیش هەر کۆن بوو.

***لەگەڵ "د.بەرهەم ساڵحو کاك عیماد ئەحمەد" سەردانی سویدتان کردبوو، بۆ چی چوو بوون؟ ئەو سەردانەتان سیاسی بوو یان شتی تر؟**

-کاتێك بەرهەم بوو بە سەرۆکی حکومەت، من لە دوو سەفەردا لەگەڵیدا بووم، کاك عیماد ئەحمەدیشمان لەگەڵ بوو، هەرسێکمان سەفەرێکی سویدو تورکیامان کرد، لەسوید وەزیری دەرەوەمان بینی ئەوکات"ئانا لیند" وەزیری دەرەوەی سوید بوو، بەداخەوە دواتر بە چەقۆ کوشتیان. لەو سەفەرەشماندا بوو کە چووینە فینلەندا..منو کاك عیماد بە کەشتی چووین.

لەسەفەرەکەی سوید، کاتێك لە وەزارەتی دەرەوە هاتینە دەرەوە، منو د.بەرهەم بەیەکەوە دەرۆیشتینو کاك عیمادو بورهان حەبییش کە ئەو کات نوێنەری "ی.ن.ك" بوو لە سوید بەیەکەوە دەرۆیشتن.

لە دوورەوە دوو گەنجی قۆڵو دەموچاو تاتۆکراوو گوارە لە گوێ بەرەو روومان دەهاتن..بەرهەم گوتی لەوە دەچی ئەمانە (....) هۆمۆکان بن، ئێمە بەکوردی ئەو قسەیەمان کرد..ئاکارو جلوبەرگیان لەوە دەچوو..چەند هەنگاوێك رۆیشتین..یەکێك لەپشتەوە تەپ، تەپ لەپشتی بەرهەمی داو گوتی کاکە تۆ هەڵە تێکەیشتووی ئێمە ئەوە(....) نیین، بەکوردی قسەیان کرد، بەرهەم گوتی کاکە ئێمە لەبەینی خۆمان قسەدەکەین، نە دەتاناسینو نەدەماننناسن، پەیوەندیمان بە ئێوەوە چییە؟ بەڵام راستی من توزێك تێك چووم..چونکە شتێکی خۆش نەبوو ئێمە تازە لە وەزارەتی دەرەوە هاتبووینە

دەرەوەو..ببێتە شەڕمان عەیبە بوو.. ئەو دوو گەنجەش بە قەلافەتو بەهێز بوون..

بەلام کاتێك کاك عیمادو بورهان پێمان گەیشتن، ئێمە بووین بە چوارو دوو کوڕەکە ڕۆیشتن. دوایی لە پیاسەیەکمان بۆ ناو بازاڕ، د.کارۆخی شەهید د.خالیدمان لەگەڵ بوو، دیسان ڕێکەوتی ئەو دوو کوڕەمان کردەوەو هاتنەوە لامان، گوتیان د.بەرهەم ئێمە تۆ دەناسینو خەڵکی سلێمانین، بەهەڵە لە ئێمە تێمەگە، ئێمەش گوتمان وەڵلا لەگەڵ ئێوەمان نەبوو، بەلام کارۆخ زۆر لەسەرخۆو بەهێمنیو بەخەندەوە گوتی کاکە ئاساییە، ئێرە ئەورووپایەو هەموو شتێك ئاساییو ڕێپێدراوە.

***سەفەرەکەتان لەگەڵ د.بەرهەم بۆ سوریا چۆن بوو، کاتێك عەبدولحەلیم خەدامتان بینی چی روویدا؟**

– بەڵێ، جارێکی تر من لەگەڵ د.بەرهەم سەردانی سوریامان کردو لەو سەفەرەدا چاومان بە عەبدولحەلیم خەدام کەوت، ئێمە سعاتو نیوێکمان دەرفەت هەبوو، د.بەرهەمو عەبدولحەلیم خەدام بەیەکەوە قسەی زۆریان کرد.. ئەوسا خەدام جێگری سەرۆکی سوریا "حافز ئەسەد"بوو، کەسێکی بەهێز بوو، ئینجا ماوەیەکی زۆریش وەزیری دەرەوەی سوریا بوو، کەسێکی شارەزاو دبلۆماتو ڕۆشنبیر بوو، لەو دانیشتنەدا من قسەم نەدەکرد، چونکە ڕاستی من عەرەبیەکەم بەو

شێوەیە نەبوو، بەرهەمیش کە لە ئەمریکا هاتبووەوە ئاگای لە زۆر شت هەبوو. کاتێك دانیشتنەکە تەواو بوو..کەسێك هاتە ژوورەوەو بە خەدامی گوت "سەیدی" ماوەی دانیشتنەکە تەواو بووەو میوانتان هەیە..خەدام داوای لێبوردنی کردو گوتی بەرهەم پێویستم بەوە هەیە ئێوارە جارێکی دیکە دانیشینەوە.. کاتەکە دیارکراو ئێوارەکەی بۆ سعاتو نیوێکی دیکە دانیشتینەوە.

ئەمەش خۆی دەلالەتی ئەوە بوو کە د.بەرهەم شتی پێ بوو، گوێی لێ دەگیراو توانایەکی هەبوو..بۆیە عەبدولحەلیم خەدام لەو پێگەیەی خۆیەوە داوای دانیشتنی دیکەی لێکرد.

***گوایە جارێکی تر لەگەڵ کاك د. بەرهەم سەردانی میسرتان کردووەو لەوێ لەگەڵ "عمرو موسا" کۆبوونەوەتان کردووە، رووداوەکانی ئەو کۆبوونەوەیە چۆن گوزەران؟**

– لەهەمان سەفەر بوو، یان سەفەرێکی دیکە بوو، سەردانی میسرمان کردو لەوێ وەزیری دەرەوەی میسر "ئەحمەد ئەبو الغیص"مان بینیو دواتر سەردانی سەرۆکی کۆمکاری عەرەبی "عمرو موسا"مان کرد.. سەرەتا کە ئێمە چووینە ژوورەوە، عمرو موسا لەپشتی مێزەکەیەوە نەهاتە ئەمدیوو منو بەرهەمیش لە سەر لا قەنەفەیەك دانیشتین.. بەلام کاتێك بەرهەم لەگەلێدا کەوتە قسەکردنو گوتی ئێمەی کورد زۆر لە

ئێـوە نيگـەرانين، تـۆ بەحيسـاب سـەرۆكى هـەموو وڵاتـانى عەرەبيت ئـەو دەوڵەتانـەش موسـڵمانن و كـورديش موسـڵمانەو وەك گـەلێك بەشـدارە لـەو شارسـتانيەت و مێـژووەى لەگـەڵ عەرەبدا هەيەتى، بەڵام تۆ پشتت لە كورد كردووەو لەبەرامبـەر رەشەكوژى و جينۆسايدو كيمياباران و ئەنفال بێدەنگيت، ئـيتر قسە ئاژنى كرد..

ديـاربوو عمـرو موسـا پێشـتر د.بەرهـەمى نـەديبوو، حەپەسابوو، يەكسەر لە پشتى مێزەكەيەوە هاتـەدەرو لـەنزيك ئێمە دانيشـت..دواتر بـووە مناقەشـەيەكى گـەرم و گوڕ..بـەڵام بەرهەم چۆن بەهێڕشەوە دەستى پێكرد..تا كۆتايش شـەڕێكى گـران و قورسـى لەگـەڵ كـرد. وەك باسـم كـرد سـەرەتا چـۆن بوو..بەڵام كـە بـەڕێى كـردين تـا لاى ئەسانسـێرەكە لەگـەڵمان هات و رێزى زۆرى گرتين.

كاتێك چووينەوە بۆ هوتێل، دەبينين پانزە، بيسـت كـەناڵى ميـديايى لـەوێ كۆبوونەتەوە..ميـدياكان گوتيـان بـۆ ئـەوە هـاتووين بـزانين ئـەمرۆ كـە عمـرو موسـاتان بينيـوە چـيتان گوتووەو رەخنەى چيتان لێگرتووە؟ قسەكراو بۆ بەيانيەكـەى هـەموو رۆژنامـەو كەناڵـە ميدياييـەكانى ميسـر باسـيان لـەو گفتوگۆيانەى نێوان هەردووكيان كردبوو..قسەكانى بەرهـەميان بەمانشێت نووسيبوو، بـۆ منـيش ئـەو رووداوە زۆر دڵخۆشـكەر بوو بەڕاستى!.

*** لەکەیەوە سەر بە تەکەتولی د. بەرهەم بوویت؟**

–لەلای من بەرهەم کەسێکی بەتوانا بوو، چاوی زۆریشی لەسەر بوو، بەڵام وەك تەکەتول من هەمیشە سەر بە تەکەتولی مام جەلال بووم، لەدوای مام جەلالیش سەربەخۆبوومو خەتی گشتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بووم.. بەڵام بەرهەمم خۆشدەویست، بەرهەم تەکتولێکی بۆ خۆی دروست کردبوو.. دواتریش لەگەڵ کاك کۆسرەت ناوەندی بڕیاریان پێکهێنابوو..من نە لەگەڵ ناوەندی بڕیارو نە لەگەڵ زۆرینەی مەکتەبی سیاسیدا بووم.. لەو ململانێیەدا من هەر بێ لایەن بووم.. هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بووم بەیەکەوە بین‌و کێشەکان چارەسەر بکەین.

ئەوەبوو د.بەرهەم هەر بەهۆی ئەو کێشانەی کە لەگەڵ ماڵی مامۆستا برایم ئەحمەددا هەیبوون..هاوپەیمانی بۆ دیموکراسیو دادپەروەری دروستکردو لە یەکێتی جیابووەوە..من لەو قۆناغەشدا پەیوەندیم لەگەڵ د.بەرهەمدا نەپچڕاندو هاوڕێیەتیم کرد..بەڵام یەکێتی بووم..زۆر برادەری دیکەی مەکتەبی سیاسیش پەیوەندیان لەگەڵ بەرهەم هەر هەبوو..پاش ساڵێكو دوای هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق، (دیارە د.بەرهەم لەو هەڵبژاردنەدا جێ پەنجەی دیار بوو)، بەڵام ئەنجامەکە بەشێوەیەکی دیکە شکایەوە..

کوڕەکانی مام جەلالیش زانیان کە بەرهەم کەسێکی بەتواناو بەتاڵ نییەو دوورکەوتنەوەی لە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان زیانێکە، بۆیە وەکو چۆن جاران دژایەتیان کردو لە یەکێتی دەریان پەڕاند، ئەمجارەیان بەرنامەکەیان گۆڕی بۆ هێنانەوەی د.بەرهەم.. تەنانەت جارێك پافڵی کوڕی مام جەلال لە کۆبوونەوەی سەرکردایەتی گوتی: "ئێمە خۆمان غەدرمان لە بەرهەم کردو بووینە هۆی ئەوەی جیابێتەوەو حزب دروست بکات..ئێمە پێویستیمان بە بەرهەم هەیەو بە بەرهەم یەکێتی بەهێز دەبێت..بۆیە ئێمە بڕیارمانداوە هەڵەکەی خۆمان راست بکەینەوەو بەرهەم بێنینەوە ناو یەکێتی"..دوای ئەوەی هەموو سەرکردایەتی رازای بوون..من بووم بە ئەندامی ئەو لێژنەیەی کە کاری تێکەڵاو بوونەوەکە رایی بکەین.

***

## ڕۆڵی د.ئەرسەلان بایز لە گەڕانەوەی د. بەرهەمو بوونی بەسەرۆك كۆماری عێراق

***دەڵێن کوڕەکانی مام جەلال لەگەڵ د.بەرهەم ڕێککەوتبوون تا بێتەوە ناو یەکێتی؟ ئەو ڕێککەوتنە چۆن بوو؟**

–دیارە پێشتر کوڕەکانی مام جەلال وەعدیان بە بەرهەم دابوو کە ئەگەر هاتەوە بیکەنە کاندیدی یەکێتی بۆ سەرۆك کۆماری عێراق..بەڵام لەناو سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ژمارەیەك برادەر پێیان خۆش نەبوو د.بەرهەم بێتەوە، بەڕای من هۆکارەکەی دەرکەوتنو بەتوانایی بەرهەم بوو..چونکە د.بەرهەم کەسێك بوو چەند زمانێکی ئەزانیو پیاوی سەردەم بوو..پەیوەندیشی لەگەڵ چەندین کەسایەتیو نێوەندی سیاسیو دیبلۆماتی دنیاو دەوروبەردا هەبوو.. زۆریش بۆ یەکێتی پێویست بوو، بۆیە ئەوانەی پێیان خۆش نەبوو، لەگەڵ هاتنەوەی کەوتنە دژایەتی کردنی..تا ئەو کاتەی قسە هاتەسەر ئەوەی کێ کاندیدی یەکێتی بێت بۆ سەرۆك کۆماری عێراقی فیدراڵ، ئەوە بووماڵی مام جەلالو خاڵە شێخ جەنگی داکۆکیان لە کاك بەرهەم کرد. د.بەرهەم خۆشی نفوزی

لـەناو سـەرکردایەتی یـەکێتی هەبوو..بەوشـێوەیە د.بەرهـەم بەزۆرینە بۆ پۆستەکە کاندید کرا.

***کێ بوون ئەوانەی ناڕازیی بوون؟**

–دیـارە ژمارەیـەك لـە هـەڤالانی مەکتـەبی سیاسـیو سەرکردایەتی بوون کە پێویست ناکات ناویـان بێـنم. دیـاربوو کاك مەلابەختیارو د.لەتیفو کاك حەمەسـابیر خۆیـان مـەرامی ئەو پۆستەیان هـەبوو..کاك مـەلا بـەختیار لەهـەموویان زیـاتر رکابەری بەرهەمی دەکردو پێیوابـوو ئـەو لـەنێو سـەرکردایەتی لەبەرهـەم دەباتەوە..بـەلام رۆژی هەلبـژاردنو سـاغکردنەوەی کاندیدی یەکێتی بـۆ سـەرۆك کۆمار..ژمارەیـەك سـەرکردایەتی چوونە لای کاك مەلا بـەختیارو پێیـان گـوت مـالی مـام جـەلال رایانسپاردووین دەنگ بـە د.بەرهـەم بدەینو پێمـان باشـە تـۆ خـۆت لـە هەلبـژاردن بکێشـیتەوە..نامانەوێ تـۆ بشـکێی..کاك مەلا بەختیار هاتە ناو کۆبوونەوەکـەی سـەرکردایەتیو هەنـدێ قسەی بەرزو نزمـی کـردو بـەزویری چـووە دەرەوە.. یـەك دوو کەسـیش لەگـەلی چـوونە دەرەوەو دواتـر دەنگـدان لـەنێوان د.بەرهـەمو د.لـەتیفو کـاك حەمـە سـابیر کـراو کـاك بەرهـەم زۆرینەی هێنا.

***خۆت دەزانی پۆستی سەرۆکی کۆماری عێراق بەشی کورد بوو لە بەغداد، ئەو کاتە ڕای پارتی دیموکراتی کوردستانو حزبەکانی دیکە لەو بارەیەوە چی بوو؟**

–پێشتر گوێم لێ ببوو کە پارتی دەیگوت با بەرهەم کاندیدی هاوبەشی هەموو لایەك بێت، بەڵام کە هاتەوە ناو یەکێتی، ئەمەیان پێ خۆش نەبوو..پارتی لەوە پەشیمان ببوەوە، بۆیە کاندیدی خۆیان بەناوی د.فوئاد حوسێن دانا.

***ئەی بۆچی ڕێك نەکەوتنو بەیەکگرتووی نەچوونە بەغداد، خۆ ئەمەیان بۆ کورد باشتر بوو؟**

–راستە، چەندین کۆبوونەوەمان لەگەڵ سەرکردایەتی پارتیو کاك نێچیرڤان بارزانی کردو پێمان گوتن کە حەقە ئێوە د. فوئاد بکێشنەوە، راستە د. فوئاد پیاوێکی بەڕێزەو دۆستمە بەڵام بۆ ئەو پۆستە لەئاستی د. بەرهەمدا نەبوو. خۆ ئەگەر ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی پارتی، یان کاك نێچیرڤان بارزانی بوایە، قسەیەکی ترمان دەبوو، بە کاك نێچیرڤانیشمان گوتبوو خۆی هەڵبژێرێتو بێتە پێشەوە. ئێرانو ئەمریکیەکانیش لەو بارەیەوە قسەیان لەگەڵ کردین تا ڕێکبکەوین..بەڵام ئەنجامی نەبوو. ئەوە بوو هەڵبژاردن لە پەرلەمانی عێراق لەنێوان دوو کاندیدی کورد کراو پەرلەمان دەنگی بە "د.بەرهەم"دا.

***راتان لەبارەی کاک مەلابەختیار بۆ ئەو پۆستە چی بوو؟**

-لەبارەی کاندیدە رکابەرەکانی خۆشمان، بەتایبەت لەبارەی کاک بەختیار، راستە پێشمەرگەو پیاوێکی تێکۆشەرو ماندووەو توانای روناکبیری‌و سیاسی زۆری هەیە..بەڵام بۆ ئەو کاتەو بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری عێراق، ئێستاش دووبارە بێتەوە من هەر دەنگ بە د. بەرهەم دەدەم.. چونکە بۆ ئەو پۆستە د.بەرهەم شایستەترو لێهاتوو ترە. لەوانەیە کارێکی دیکە بێتە پێشەوە، دەنگ بە کاك مەلا بەختیار بدەم.

***رۆڵی تۆ لە بوونی د. بەرهەم بە سەرۆك کۆماری عێراق چی بوو؟**

-چوونی ئێمە بۆ بەغداد بە بەرنامە نەبوو..دوو رۆژ پێش هەڵبژاردنی سەرۆکی عێراقی فیدراڵ، کاك کۆسرەت سعات 9ی شەو تەلەفۆنی بۆ کردم‌و گوتی: ئەرسەلان دەبێ بچینە بەغداد، دەعوەتێکم بۆ لایەنە عێراقیەکان بۆ پشتیوانی د. بەرهەم رێکخستووە..دەمەوێ تۆش بێیت..گوتم کاك کۆسرەت من تەندروستیم باش نییە، گوتی هەر دەبێ بێیت. لەبەر خاتری ئەو هەر ئەو شەوە بۆ سلێمانی بەرێکەوتم‌و سعاتی دوانزە گەیشتم..بەیانیەکەی ئێمە بە فڕۆکەیەکی سەربازی چووینە بەغداد، چوونەکە بۆ ئەوە بوو یەك رۆژ لەوێ بین‌و

بگەڕێینەوە..ئێمە هەموومان لەناو ئەو فڕۆکەیەدا بووین‌و وێنەمان گیرابوو، لەتۆڕی کۆمەڵایەتیش "فێسبوك" بڵاوکرابوەوە.

برادەرانی پارتی کە ئەمەیان بینی بوو، پێیانوابوو کە وەفدێکی گەورەی یەکێتی بۆ پشتیوانی د.بەرهەم چۆتە بەغداد، بۆیە بۆ بەیانی بڕیاریانداو ئەوانیش شاندێکیان بەسەرپەرشتی کاك نێچیرڤان بارزانی‌و کاك ئازاد بەرواری ناردە بەغداد..کاتێك ئەوانیش هاتن، برادەران گوتیان تازە نابێ ئێوە بڕۆنەوە. چونکە پارتی هاتووەو دەبێ هەندێك کەسی ئێمەش لێرە بن‌و ئیش‌و کارەکان بکەن. بەو شێوەیە وەك دیفاکتۆ بووین بە وەفدی یەکێتی. بەشی زۆری لایەنەکان لەوانە عەمار حەکیم‌و ئایاد عەلاوی‌و نوری مالکی‌و نوێنەری صەدرییەکان‌و چەندین کەسایەتی دیکەش هاتنە لای کاك کۆسرەت‌و خۆشمان چووینە لای سەرۆك وەزیرانی عێراق "حەیدر ئەلعەبادی".

لەو یەك دوو رۆژەدا، چەندین جار لەگەڵ شاندی پارتی‌و شاندی ئەمریکا بەسەرپەرشتی "ماککگۆرك"و شاندی ئێرانی بەسەرپەرشتی "قاسمی سلێمانی" کۆبووینەوە، تاوەکو بزانین چۆن چارەسەری ئەو مەسەلەیە بکەین‌و تەنها کوردێك بکەینە کاندید.

برادەرانی پارتی سوور بوون لەسەر ئەوەی دەبێ د.بەرهەم بکشێتەوە، گوتیان ئەگەر بەرهەم بکشێتەوە، لە کابینەی داهاتووی حکومەتی هەرێم دووساڵ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران دەدەین بە یەکێتی. بەڵام ئێمە گوتمان با لە بەغدادیش دوو ساڵی یەکەم د.بەرهەم سەرۆك بێتو دوو ساڵی دواتر د. فوئاد حوسێن سەرۆك بێت. کاك نێچیرڤان رازی نەبوو..کاتێك رازای نەبوو..هەر لە گەڕانەوەمان لە دیدەنیەکەی پارتی، لەبەینی بارەگای کاك نێچیرڤانو ئەو شوێنەی ئێمەی لێ بووین، هەر لەناو سەیارە کاك کۆسرەت بریاریداو پەیوەندی بە هەموو لایەکەوە کردو گوتی با پەرلەمان کۆبێتەوەو دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی عێراق بکرێت..خوا بەکێی دا با بیدات.

***قسە دەکرا کە پارتی لەو هەڵوێستەی یەکێتیو بەتایبەتیش لە رۆڵی تۆ نیگەران بوویێت، ئایا ئەمە راستە؟**

-بەداخەوە هەندێ لە برادەرانی خۆمان خەبەریان بە پارتی دابوو، گوایە من رۆڵی سەرەکیم هەبووە لەوەی د.بەرهەم نەکشێتەوەو داکۆکیم کردووە کە هەر دەبێ ببێتە سەرۆکی کۆمار.. بێگومان دەشزانم کە کێبووە ئەو خەبەرەی داوەتە پارتی. شەرم لەکەس ناکەمو تازە شتەکە تێپەڕیوە، رۆڵم

هەبووە، بەلاّم نەك رۆڵی سەرەكی.. لەوانەیە هەندێ كەس لەناو یەكێتی رێكەوتنی ژێر بەژێریان لەگەڵ پارتیش هەبووبێت و كردبێت تا بەرهەم بكشێتەوەو د. فوئاد ببێتە سەرۆك كۆمار، چونكە كەسانێك هەبوون گوتبوویان تازە د.بەرهەم لەنێو پەنجەكانی ئێمە كەوتەخوارەوە. دیارە من هەمیشە لەگەڵ تەبایی و یەكریزی كوردم، دۆستی پارتیشم، بەلاّم لەو پرۆسەیەدا پارتی ناهەق بوو. شاندەكەی یەكێتیش جگە لەمن ئاسۆ ئەڵمانی و عەدنانی حەمەی میناو خالد شوانی و بافڵی مام جەلال و لاهوری شێخ جەنگی و ئاراسی برای و ئیسماعیل مەحمودی تێدابوون و هەموشمان هاوكاری د.بەرهەم بووین.

لەبارەی پارتیشەوە، پارتی لەتەواوی پرۆسەكەو رێكنەكەوتنەكە نیگەرانبوو، درزیش كەوتە نێوانمان.

****

# تێکچوونی پەیوەندی

## د. ئەرسەلان بایزو هێرۆخان

***زۆر باسی پەیوەندی و دۆستایەتی خۆت و هێرۆخان دەکەی، کەوا پەیوەندیتان بەیەکەوە باشبووە..کەواتە بۆچی ئەو پەیوەندیەتان درزی تێکەوت و بەردەوام نەبوو؟**

–یەکەمین ناسینم لەگەڵ هێرۆخان بۆ حەفتاکانی سەدەی رابردوو دەگەڕێتەوە کە من لەبەشی کوردی زانکۆی بەغداد بووم و ئەویش لە کۆلێژی پەروەردە لەبەشی دەروونزانی خوێندکاربوو. لەهەندێ بۆنەو ئاهەنگ و گەشتیشدا دەمبینی، بەڵام هیچ پەیوەندییەکم لەگەڵ نەبوو، تەنها ئەمزانی ئەوە هێرۆخانە..جارێکیش لەدەورەی کادیران لە بەغداد مام جەلال دەرسی پێدەگوتینەوە، هێرۆخان لەوێ بوو، بەڵام دەمزانی کە هێرۆخان وەك دەستگیرانی مامجەلال وایە..مامجەلال چووبووە داوای..دوای زانکۆ هێرۆخانم نەبینیەوە. تاوەکو مانگی 1ی ساڵی 1980. کاتێك لە کۆتایی 1979 بوومە پێشمەرگە قەمسەڵەیەکی شینم لەبەردا بوو، برایمی برام تازە لە کوێت

بۆی هێنابووم..کە لەناو زەنگ بووین هێرۆخان هەمیشە پێی دەگوتم ئا ئەو کاتە قەمسەڵەیەکی شینت لەبەر بوو.

دواتر وردە وردە پەیوەندی من لەگەڵ مام جەلالو هێرۆخانیش گەشەی کرد، بەتایبەت کە منیان وەك لێپرسراوی رادیۆ دانا. کاتێك دەچوومە لای مام جەلال تاوەکو رێنمایم پێبدات، یان وتارم بۆ رادیۆ بۆ بنوسێت. یان کە کتێبەکانیم بۆ خوێندنەوە وەردەگرت، زانیم هێرۆخانیش خەریکی خوێندنەوەو چیرۆك نووسینە..دەشی بینی من هەندێ جار کتێبی ئەدەبی لە مام جەلال وەردەگرم..گوتی پێم خۆشە دابنیشین، چەندین جار دانیشتینو لەبارەی چیرۆکەکانیەوە قسەمان دەکرد.

بەو شێوەیە پەیوەندیم لەگەڵ هێرۆخان زۆر بەهێز بوو، تا وای لێهات بەبێ پرس دەچوومە ماڵی مام جەلال، خۆی لەوێ با یان نا، لەگەڵ هێرۆخان دادەنیشتینو قاوەمان دەخواردەوە.. زۆریش لەوە زیاتر کە یوسف زۆزانی لە ئەوروپا هاتەوە، هەردووکمان بەیەکەوە دەچووینە لای هێرۆخان، ئەویش دەهاتە ماڵی یوسفو ماڵی ئێمەش. بۆیە پەیوەندی هەردووکمان لەگەڵ هێرۆخان بەردەوامو لە نەبڕان بوو.

هەر لەبەر خاتری هێرۆخانیش بوو من سێ ساڵ لە کەناڵی ئاسمانی کوردسات کارم کرد..من هیچ کارێکم لەوێ نەبوو..بەڵام لەسەر داوای هێرۆخان چوومە ئەوێ. رۆژانە تەنها

سەیری ماددەکانم دەکردو دەگەڕامەوە..پەیوەندیم بە بودجەو دامەزراندنی کارمەندو شتی ئیدارییەوە نەبوو. بەڵام هێرۆخان خوشکێکی خۆشەویست بوو، ژنێکی زۆر زۆر باش بوو، دایکی پێشمەرگە بوو..خوشکی پێشمەرگە بوو. ژنێکی لەخۆبوردە بوو..خۆنەویست بوو..هەرچی ئەرشیفی سەردەمی شۆڕشە سەدا نۆهەدی بۆ هێرۆخان دەگەڕێتەوە، بەتایبەت فیلمو تۆمارەکان.

بەڵام، بەداخەوە کاتێك خوشکەکانی هاتنەوە بۆ کوردستان، بوونە هۆی تێکدانی پەیوەندی نێوان منو هێرۆخان، ئومێد دەکەم ئەو خوشکانەی لەژیانیاندا خۆشی لەخۆیان نەبین کە پەیوەندی منو هێرۆخانیان تێکدا. ئێستاش کە ڕۆژانە دێتەبیرم خەمی لێ دەخۆم.

***

## پەیوەندی د. ئەرسەلان بایزو کاك کۆسرەت رەسوڵ

***دەڵێن دایکی کاك کوسرەت، بەکاك کۆسرەتی گوتووە ئەرسەلان برای تۆیە؟ ئەمە چۆن بوو؟**

-راستە، ئەو مەسەلەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاوارەییمان لە ئێران، ئەو کاتە بوو کاك نەوشیروان وەك نەفیکردن منی نارده بەرەی کوردستانیو کاك فەرێدون عەبدولقادری لەشوێنی من کردە بەرپرسی دەزگای راگەیاندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

من ماڵم لە ورمێ بوو، ئۆتۆمۆبیلێکی رینۆی بچووکم هەبوو، کۆمپانیاکە لەناوخۆی ئێران دروستی دەکرد. رۆژێکیان منو پەخشان ویستمان لە "ورمێ"وە بچینە سەقز، چونکە ئەوکات سەقز والگەی ئاوارەکان بوو، هەموو لەوێ کۆببوونەوە.. بەڵام ماڵی کاك کۆسرەتو هەندێ لە برادەران لە مهاباد بوو. لەسەفەرەکەماندا بۆ سەردان لاماندایە ماڵی کاك کۆسرەت، ئەوسا بەرەحمەت بێت باوکی کاك کۆسرەت مام رەسوڵ نەخۆش بوو. کاتێك گەیشتنە ماڵیان "زبێدەخانی" دایکی کاك کۆسرەت گوتی..ئەوە ئێمە بەتەمابووین بێینە لای تۆ، کەچی تۆ هاتویتە لای ئێمە! زبێدەخان ژنێکی وریاو زیرەكو عاقڵ بوو، کەم ژنی ئاوا وریام بینیووە.

گوتم: جا بەخێربێن سەرچاوان، چۆنە وابڕیارتان داوە؟
گوتی: سبەینی "رەسوڵ"ی دەبەینە تاران، ویستمان ئەمشەو بێینە لای تۆو دواتر تۆش لەوێ سەفەرەکەمان بۆ تاران بە تەیارە بۆ رێك بخەیت.
گوتم: بەسەرچاو..ئێستا من منداڵەکان دەگەیەنمە سەقزو خۆم دەگەڕێمەوە دەتانبەم.
ئەوەبوو چومە سەقزو دواتر هاتمەوە لایانو زبێدەخانو مام رەسوڵو یەکێکی تر بوون، بە ئۆتۆمۆبێلی خۆم بردنەمەوە بۆ ورمێو لە ماڵی خۆمان خزمەتمکردنو بەیانیەکەشی بردنمە فرۆکەخانەو بەرەو تاران بەڕێکەوتن.
دیارە من سوپاسی زبێدەخان دەکەم کەوا هەر جارێك منی دەدیت وەك کوڕی خۆی رێزی لێ دەگرتم..هەمیشە بە کاك کۆسرەتیشی دەگوت ئەرسەلان برای تۆیە. وەك گاڵتەو گەپیش زبێدەخان ژنێکی قسەبەدەستو هەمیشە قسە سوار بوو..بیرم دێت رۆژێك لەگەڵ کاك شوانی رەحمەتی "بەهرۆز قەشقە" چووینە سەردانیان، دیاربوو بەهرۆز پێتریش شەڕە قسەو گاڵتەی لەگەڵ زبێدەخان هەبوو..بەهرۆز گوتی: زبێدەخان ئەو خەڵکە زۆر سەیرە، فێربوون زۆر جوێن بە بەرپرسەکان دەدەن، جنێو بە کاك کۆسرەتیش دەدەن.
–زبێدەخان یەکسەر بەجواب هاتو گوتی ئا..کوڕم دەزانم..رۆژێك دێت جنێو بەدایکی تۆش دەدەن..ئێمەش

کردمانــە پێکــەنینو گوتمــان بــەهرۆز واز بێنــە دەرەقــەتی زبێدەخان نایەیەت.

***جارێکیان لەگەڵ کاک کۆسرەت سەردانی "تاران"تان کرد، لەو دیدارەتاندا لەگەڵ بەرپرسانی ئێران چی روویدا؟**

–راستە، جارێکیان وەك شاندی یەکێتی لەگەڵ کاك کۆسرەتو شێخ دارۆی رەحمەتی بۆ هەندێ ئیشو کاری یەکێتی چووینە تاران، لەوێ کۆبوونەوەیەکمان لە بارەگای سوپای پاسداران لەگەڵ "جەعفەری" کرد، ئەو کات ئەو جێگری بەرپرسی پاسداران بوو، لە کۆبوونەوەکەدا هەندێ بابەت لەبارەی کوردانی رۆژهەلاتی کوردستانو حزبی دیموکراتو ئەوانی دیکە باسکران، کاك کۆسرەت گوتی ئێمە بە زیانگەیاندن بە کوردەکانی ئێران رازی نینو هەموومان کوردین، چۆن ئێوە بەرگری لە شیعە دەکەن، ئێمە ئەگەر نەشتوانین بەرگری لە کوردانی رۆژهەلات بکەین، بەلام هیچ هاوکارییەکی ئێرانیش لەدژی ئەوان ناکەین..چونکە میللەتەکەمان ئەوەمان لێ قبوڵناکاتو ناتوانین هاوکاری ئێوە بکەین لەدژی ئەوانو بەو شێوەیە کۆبوونەوەکە کۆتایی هات. دواتر کەچووینەوە کاك کۆسرەت داوای کرد بچینە نەخۆشخانە تاوەکو چەند پشکنینێکی خۆی بکات، کە دکتۆرەکەی هات گوتی دوو دکتۆری دیکەش بانگ بکەن تا ئەو دوو کەسەش بپشکنن، گوتمان خۆ ئێمە نەخۆش نین، من لەوساوە پارێز دەکەم، چونکە کۆرسترۆڵەکەم ئەو کات 220 بوو.

# تەجمیدکردنی د. ئەرسەلان بایزو
# جارێکتر بوونی بە سەرکردایەتی یەکێتی

***دوای تەجمیدکردنت لە سەرکردایەتی لەلایەن کاک نەوشیروانەوە، چۆن دەستت بەخەباتکردەوە؟**

دوای هاتنەوەمان لەشاخو پێشمەرگایەتی، من درەنگتر لە ئێران هاتمەوە، چونکە قاچم شکابوو، مانگی 7ی ساڵی 1991 بوو گەیشتمەوە.. کاتێك هاتمەوە مام جەلالو کاك نەوشیروانو کاك کۆسرەت لە هەوڵی کۆکردنەوەی رۆژنامەنوسو نوسەرانو هونەرمەندو رۆشنبیراندا بوون بۆ ئەوەی رۆژنامەیەکی رۆژانە دەربکەن..بەڕاستی هەنگاوی باش چووبوونە پێشەوە، بەڵام کە من هاتمەوە ئەرکەکەیان بەمن سپارد..ئیتر من ئیدارەی ئەو رۆشنبیرو نوسەرو رۆژنامەنوسانەمدا تاوەکو بڕیاری دەرکردنی ژمارە "سفر"ی رۆژنامەی کوردستانی نوێ دراو بە بڕیاری مەکتەبی سیاسیش من بوومە یەکەمین سەرنووسەری، یەکەمین رۆژنامەی کوردی دوای راپەڕین.

من دوای ئەوەی ساڵی 1990، لەلایەن کاك نەوشیروانەوە تەجمید کرابووم، هیچ پلەو پایەیەکی حزبیم نەبوو، تەنها وەك

پێشمەرگەیەکی سادە بوومو تێدەسوڕام..بەڵام کە هاتینەوە ئەو کات بارەگای مامجەلال لە شەقلاوە بوو، هێشتا بەتەواوی قاچم چاك نەببوەوە، بەدارشەق دەرۆیشتم..کاك کۆسرەت پشتیوانی لێکردم، مام جەلال کەمتر دەیویست شەڕی کاك نەوشیروان بکات، بەڵام کاك کۆسرەت بێ منەتر بوو لێی.

چەند جارێك وتارەکانیان بەمن دەسپارد تا لە بۆنەکاندا بیانووسمو بیانخوێنمەوە..هێشتا هیچ پلەیەکم نەبوو، وتاری مەکتەبی سیاسی یەکێتیان بەمن دەسپارد..تا رۆژێك مام جەلالو کاك کۆسرەتو من بەیەکەوە بووین..گوتم ناکرێ من هەر ئاوابم..جێگایەکم بۆ دیاربکەن..ئەوەبوو کاك کۆسرەت گوتی برۆ وەك کارگێڕی مەڵبەندی سێی هەولێر دەوام بکە، مام جەلالیش هیچ قسەی نەکرد.

کاتێك مام جەلال قسەی نەکرد، من هاتم لە ئەندامی سەرکردایەتیەوە کە پێشتر سەرکردایەتی بوومو بەرپرسی دەزگای راگەیاندنی یەکێتی بووم..سەرپەرشتی دەزگای راگەیاندنی بەرەی کوردستانیشم تاڕادەیەك دەکرد..هاتمەوە وەك کارگێڕی مەڵبەندی هەولێر دەستم بەکارەکانم کردەوە.

ئەو کات شەهید حەسەن کوێستانی بەرپرسی مەڵبەند بوو. لەکاتێکدا من زۆر پێشتر لە کاك حەسەن بەرپرسیارێتیم هەبوو..شەهید شاخەوان عەباس جێگری بەرپرسی مەڵبەند

بوو، من بەرپرسیارێتی هەردووکیانم بەچاوان قبوڵکرد. بەڵام باوەڕم بەخۆم هەبوو..متمانەم بەخۆ هەبوو..

***کەی بوو جارێکی دیکە بوویەوە بەئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان؟**

لە یەکەمین کۆنگرەی "ی.ن.ك" لەساڵی 1992 کە لە سلێمانی بەستراو دواتر هێنرایەوە هەولێر، بوومەوە بە سەرکردایەتی یەکێتی، لەو کۆنگرەیەدا تەنها سێ چوار کەسمان دەرچووین. دیارە مام جەلال بەبێ هەڵبژاردن وەك سکرتێر دەست نیشانکرایەوەو لەهەڵبژاردنیشدا کاك کۆسرەت‌و کاك عومەری سەید عەلی‌و عارف روشدی‌و من، دەرچووین. کەسیتر "1+50"ی نەهێنا.. ئیتر دوای ئەوە من هەم بووم بە لێپرسراوی رۆژنامەی کوردستانی‌و بەرپرسی مەڵبەندی هەولێریش لە جێگەی کاك "حەسەن"، بەو شێوەیە وردە وردە چوومەوە پێشەوە.

# بەرپرسیارێتی د. ئەرسەلان بایز
# لە مەکتەبی رێکخستن و لادانی

***ئەی کەی بوو، بوویە بەرپرسی مەکتەبی رێکخستن؟**

سالّی 1995 رۆژێك مام جەلال بانگی کردم..گوتی پێم باشە کاك عەدنان موفتی بکەینە بەرپرسی مەلّبەندی هەولێر، چونکە خۆی هەولێرییەو پەیوەندی باشی لەگەلّ خەلّکی شارەکە هەیە.. بەو شێوەیە منی وەك بەرپرسی مەکتەبی رێکخستن دەستنیشانکرد..بەلاّم بەدرێژایی ئەو هەموو سالاّنەی لە مەکتەبی رێکخستن بووم، هەر لە خەتی مام جەلال بووم و پشتیوانیم لە سیاسەتەکانی دەکرد..نزیکەی نۆ سالّ لەو کارەمدا بەردەوام بووم..لەکاتێکدا نێوانی مام جەلال و کاك نەوشیروان و کاك کۆسرەت و کاك جەبار فەرمان لەوپەڕی ململانێدابوو..بەلاّم من توانیم ئیدارەی هەموویان بدەم..راستی ستافێکی زۆرباشم لەمەکتەبی رێکخستن لەگەلّدا بوون..ئێستا ئەو خوشك و برایانە زۆربەیان ئەندامی سەرکردایەتین و لەپلەو پایەی بالاّدان..هەندێکیان بوون بە وەزیرو پەرلەمانتارو مەکتەبی سیاسیش.

***چۆن بوو لە مەکتەبی رێکخستن لادرای؟ خۆت داوات کرد یان بڕیاری لابردنیان دایت؟**

-خۆت دەزانی تەکەتول لەناو یەکێتی هەبوو، ئەگەرچی من ئیدارەی هەموویانم ئەدا، بەڵام ململانێی ئەوەیان لەگەڵ دەکردم کە سەر بە مام جەلالم..من نە سەر بە کاك نەوشیروانو نە سەر بە کاك کۆسرت بووم..بەڵام رێزی هەموویانم دەگرت..بەتایبەت کاك نەوشیروان منی قبوڵ نەبوو، ئەگەرچی من ئەوم وەك بەرپرسی خۆم قبوڵ بوو..کاك کۆسرەت وانەبوو..من زۆر بۆ ئەو باش بووم، ئەویش لەگەڵم باش بوو..بەڵام پێگەی ئەو لەپێگەی من گەورەتر بوو. پێش من ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو، ئەو سەرۆکی حکومەت بوو، من وەزیر بووم..هەمیشە بەکاك کۆسرەتم دەگوت..مام جەلال لەسەرووی هەموو راوبۆچوونو کوتلەیەکەوەیە.. بەدەر لەمام جەلال تۆ بەتەنها نیت، من براتم لە مەکتەبی سیاسی. بەڵام بەردەوام ململانێشم لەگەڵ هەبوو. کاك کۆسرەت قەت پرسو رای ناکردو خۆی بڕیارەکانی دەدان، پرسیشی بکردبا، هیچ نەبوو چونکە خۆی چی بویستبا هەر ئەوەی دەکرد. من لەو هەڵوێستانەی نیگەران بووم، ئینجا کۆمەڵێك لە برادەرەکانی منی لە هاوکێشەو کارکردنـدا خشتبوونە دەرەوە.. هەم لەسەردەمی پێشمەرگایەتیو هەمیش دواتر.. نایشارمەوە لەگەڵ خۆمو ماڵو منداڵم زۆر باشبوو..بەڵام لەڕووی سیاسیەوە جیاوازیمان هەبوو.

***ئایا هیچ سەرپێچیەك ئەبینیەوە کە بووبێتە هۆی بڕیاری لادانت؟**

-ئەو ساڵانەی لە مەکتەبی ڕێکخستن بووم، بەشاهیدی هەموو ڕێکخستن‌و کادیرەکان کە ئێستا زۆربەیان ماون، مانگانە سەردانی هەموو مەڵبەندەکانمان دەکرد، خۆشم تەواوی کادیرەکانم دەناسین..ژمارەی کادیرەکان ئەو کاتە بەو شێوەیەی ئێستا نەبوو..کادیر سەنگ‌و قورسایی خۆی هەبوو، بۆنموونە مەڵبەندێکی وەکو هەولێر 7 کارگێڕو دوو جێگری هەبوون‌و هەموو ستافی مەڵبەندەکەش لە 25 کەس تێنەدەپەڕین، بەڵام ئێستا هەمان مەڵبەند ئەنجومەنەکەی نزیکە چوارسەد کەس ئەبن، بەشێوەیەکە هۆڵی کۆبوونەوەکان بەس بەشی خۆیان ئەکات. جگە لەوە چەند لێژنەیەکمان لە پیاوە تێکۆشەرەکانی مەکتەبی ڕێکخستن هەبوو، هەمیشە بەسەر ئۆرگانەکاندا دەگەڕان‌و ئیمکانیەتی باشیش لەبەردەستی مەکتەبی ڕێکخستن‌و مەڵبەندەکان بوو، کارەکان وەکو گوڵ بەڕێوە دەچوون. ئەگەر بۆ ڕاپۆرتی سیاسی مام جەلالیش لە کۆنگرەی "2"ی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بگەڕێینەوە، ئاماژە بە ڕۆڵی مەکتەبی ڕێکخستن دەدات.. کە چیمان کردووەو چۆن ئیدارەی ڕێکخستنەکانمان کردووەو چۆن کادیر لەسەردەمی ئێمە سەنگی هەبووە.

ململانێکان لەناو "ی.ن.ك" بەردەوام بوون، زۆر هەوڵی دوورخستنەوەی منیان دەدا..چەند جارێك هەوڵیانداو سەرکەوتوو نەبوون..تا گەیشتە ئەو حاڵەتەی خۆم تێگەیشتم‌و پێویست بوو جێگایەکی دیکە بۆخۆم بدۆزمەوە.

## بوونی د. ئەرسەلان بایز
## بە سەرۆکی پەرلەمانی کوردستانو
## راستی درێژکردنەوەی ماوەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان

***چۆن بوو خۆت بۆ پەرلەمان هەڵبژارد؟ هەر لەبەر ئەوە بوو کە لە مەکتەبی رێکخستن ململانێیان دەکردیت؟**

-کاتێك هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان بۆ خولی سێیەم لە ساڵی 2009 هاتەپێشەوە، گوتم خۆم هەڵدەبژێرم..ئەو کاتە لیستی ئێمە لەگەڵ پارتی هاوبەش بوو، د.بەرهەم سەرۆکی لیست بوو، د. کەمال کەرکوکیشی تێدابوو..خۆم لەوە دڵنیا بووم کە د.بەرهەم دەبێتە سەرۆکی حکومەتو د.کەمالیش دەبێتە سەرۆکی پەرلەمان، بەو حیسابەش دەبوو من ببمە جێگری سەرۆکی پەرلەمان.

لە کوردستانو لەناو پارتیشدا، ئەوە باوە کە ژیانو مامەڵەکردن لەگەڵ د.کەمال کەرکوکی ئاسان نییەو قورسە، بەڵام من هەرچۆنێك بوو قبوڵم کردو ئەو ماوەیەی لەگەڵ د.کەمالیش بەیەکەوە دووساڵ لەسەرۆکایەتی پەرلەمان بووین هەوڵمدا بگونجێم..راستە کێشەو گرفتمان دەبوو، هەندێجار

قسەی بەرزو نزمیش لەنێوانماندا هەبوو، بەلاّم من وا بیرم دەکردەوە کە ئەگەر لەگەلّ د. کەمال ئیدارە نەکەین‌و کێشەمان هەبێت..ئەوسا مام جەلال‌و کاك مەسعود دەکەونە بەینمان‌و پێشمان دەلّێن ئێوە عەیب ناکەن وا دەکەن‌و ئاشتمان دەکەنەوە..لەراستیدا د.کەمالیش بەوشێوەیە خراپ نەبوو کە باسیان دەکرد. بۆیە دووسالّ بووم بەجێگری د.کەمال، لەدوای رۆیشتنی د.بەرهەمیش‌و گەڕانەوەی کاك نێچیرڤان بارزانی بۆ سەرۆکی حکومەت، من بووم بە سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان.

***کاتێك بووی بە سەرۆکی پەرلەمان، یەکەم کارت لابردنی وێنەی رابەری شۆڕشی ئەیلول "مستەفا بارزانی" بوو، هۆکارەکەی چی بوو؟ هەلّوێستی سەرۆکی هەرێم کاك "مەسعود بارزانی" لەوبارەیەوە چۆن بوو؟ ئایا نیگەرانی خۆی پێ ڕاگەیاندی؟**

-کاتێك کە بوومە سەرۆکی پەرلەمان، لەپشتی کورسیەکەی من وێنەی بارزانی رەحمەتی هەلّواسرابوو..من ئێستا بۆ یەکەمین جارە ئەو قسەیە دەکەم..پرس‌و ڕام بەیەك دوو کەسی بەرپرسی پارتی کردبوو، پێم گوتن من رێزم بۆ بارزانی رەحمەتی هەیە، بەلاّم من پارتی نیم، یاسایەکی پەرلەمانیش بۆ هەلّواسینی رەسمی بارزانی لە دامودەزگاکانی حکومەت هەیە، بەلاّم مەرج نییە کە هەردەبێ لەپشتی سەری

لێپرسراوی دامەزراوەکە بێت، بەفەرمیش هیچ پێگەیەکی هاوبەشی لەگەڵ "ی.ن.ک"دا نیە، بارزانی رەمزی کوردەو رابەری شۆڕشی کوردی کردووە..بۆیە من ئەو رەسمە لەپشتی سەرم لادەبەمو دەیبەمە لا دیوارەکەی دیکەو رەسمی مام جەلالو کاك مەسعود کە فەرمیەو یەکیان سەرۆکی عێراقو ئەویتریان سەرۆکی هەرێمە دێنمە پشتی سەرم هەڵیدەواسم..ئەو برادەرانەی پارتی گوتیان شتێکی ئاساییە..بۆیە منیش جێگۆڕکێم بە رەسمەکان کرد.

کاتێك پارتیەکانی ناو پەرلەمان ئەوەیان بینی تەلەفۆنیان بۆ مەکتەبی سیاسی خۆیانو بارەگای کاك مەسعود کردبوو..بەو شێوەیە گوتیان نابێ ئەو رەسمە لابرێتو دەبێ بچێتەوە شوێنی خۆی..چەند کەسێکیش لە سەرکردایەتی پارتی هەڕەشەیان بۆ من ناردبوو، چاودێری پێشمەرگەکانیشیان دەکردین..لە تەلەفزیۆنیش بەئاشکرا هەڕەشەیان لێکردم.

من چەند رۆژێك نەچوومەوە دەوام..رۆژێك مام جەلال بانگی کردمو گوتی ئەو بابەتە چییە؟..مەسەلەکەم بۆ باس کرد..گوتی ئەبێ چاکی بکەیەوە!

گوتم چی چاك بکەمەوە، گوتی کێشەیەکت دروست کردووەو چاکی بکەوە..

–گوتم مام جەلال من کارێکی دژ بە یاسام نەکردەوە، بەیاساش جولاَوەمەتەوەو رەسمەکەی جەنابتو کاك مەسعود فەرمیەو لەکوردستان کشتاندنی بەیاسا بۆکراوە تا هەلَبواسری، پێشم وایە بارزانی رەحمەتی لەکاك مەسعود گەورەترە کە کورەکەی ئەوم قبولَ بێت رەسمی لەپشتی منەوە بێت بۆ بارزانی رەحمەتیم قبولَ نییە..بەلاَم ئەوە بەپێی یاسا نابێت.

– گوتی بەهەرحالَ ئەو قسەیەت بە پارتی گووتووە.

–گوتم جا بۆ پارتی گوێم لێدەگرن، هەر هەرەشە دەنێرن.

هەمان رۆژ ئێوارەکەی کاك نێچیرڤان مالَی ئاوابێت هەمیشە خەمخۆرو فریادرەس بوو، لە ئەمریکاوە تەلەفۆنی بۆکردم..گوتی چی بووە..مەسەلەکەم وەك خۆی بۆ باسکرد..گوتی هەر ئەوەیە..گوتم بەلَێ..

–گوتی هیچ نییە بەیانی برۆ دەوام بکەوەو کێشەکە بۆ خۆم لێگەرێ.

بەیانی کە چوومەوە دەوام، شاندێکی پارتی بەسەرۆکایەتی کاك فازلَ میرانیو چەند ئەندامێکی مەکتەبی سیاسیو شێخ عەبدولموهەیمەن بارزانی هاتنە پەرلەمان، تەماشای رەسمەکەیان کردو گوتیان ئەدی ئەوە نییە رەسمەکە لەشوێنی خۆیو لەژوورەکەیە..ئیشەکەیان پێ ئاسایی بوو. قسەمان کردو دواتر رۆیشتن.

بەڵام کاك مەسعود تا دوو سێ مانگ قسەی لەگەڵ نەکردمو منیش هەر شوێنو بۆنەیەك کاك مەسعودی لێبایە نەدەچووم..چونکە هەم لەمن گەورەتر بوو، هەمیش سەرۆکی هەرێمی کوردستان بوو، رێزیشم دەگرتو نەمدەویست چاومان بەیەك بکەوێتو ئەو قسەیەك بکاتو منیش نارحەت ببم.

لەئاهەنگی نەورۆزی هەمان ساڵی 2012 لەپارکی شانەدەر کاك مەسعود ئامادەببوو، ڤانیای کچیشم چووبووە ئاهەنگەکەو خۆشی تۆزێك چالاكو کارایەو لەگەڵ هاوڕێکانی ویستبووی بچێتە لای کاك مەسعود، پاسەوانەکانیش رێگایان نەدابوو، ڤانیا گوتبووی من کچی ئەرسەلان بایزم سەرۆکی پەرلەمانو چووبووە لای کاك مەسعودو خۆی ناساندبوو، گوتبووی من کچی ئەرسەلان بایزم، سوپاسی کاك مەسعود دەکەم زۆر رێزی لێ گرتبوو، شوێنیشیان بۆ کردبوونەوە..کاك سەعدی ئەحمەد پیرەش لەوێ بیوو، هاوکاری کردبوونو شوێنیان بۆ کردبوونەوە.

دوای مانگێك، رۆژێك د.فوئاد حوسێنی سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی هەرێم تەلەفۆنی بۆ کردمو گوتی کاك مەسعود دەیەوێ سەردانێکی بکەی.. کاتێك چووم خوا هەڵناگرێ لەژوورەکەی هاتبووە دەرەوەو پێشوازی لێکردم.. گوتی لەسەرەتا وایان تێ گەیاندم رەسمە گەورەکەی هۆڵەکەتان

هەڵگرتووە کە بە یاسای پەرلەمان لەویێ دانراوەو خراپیان تێگەیاندمو ئەوەی رۆیشت، رۆیشتو تەواو.

گوتم، من بە مام جەلالیشم وا گوتووە کە جەنابتم قبوڵ بێت، باوکت لەتۆ گەورەترو ناودارتر بوو، چۆن بارزانی رەحمەتیم قبوڵ نییە.. بەهەرحاڵ ساردیەکەی نێوانمان بەو شێوەیە کۆتایی هات.

***بۆچی بویتە هۆی درێژکردنەوەی ماوەی سەرۆکایەتی سەرۆکی هەرێم کاک مەسعود بارزانی، کاتێک دەتزانی خەڵکێکی زۆر پێیان ناخۆشە؟**

–لە کۆتایی خولی پەرلەمان کە من دوو ساڵ سەرۆك بووم کێشەیەکی گەورە هات پێشەوە، ئەویش درێژکردنەوەو نوێکردنەوەی وادەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بوو کە ماوەکەی بەسەر دەچوو، بەمەش هەرێمی کوردستان دەکەوتە بۆشایی یاساییەوە. ئەو کارە کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە ئەو کاتە گۆڕانو کۆمەڵو یەکگرتوو، نزیکەی "34" کورسیان هەبوو، شەڕی پەرلەمانی قورسیان دەکرد، زۆر دژی نوێکردنەوەی سەرۆکایەتی کاك مەسعود بارزانی بوون. من دوو سێ جار لەگەڵ هێرۆخان لەو بارەیەوە قسەم کردبوو، گوتی بەڵێ من پێم باشە وادەکە بۆ کاك مەسعود درێژبکەینەوە، ئەگەر مەسەلەکەش هاتەپێشەوە سڵی لێمەکەوە..منیش گوتم

من خۆشم قەناعەتم وایە.. لەڕاستیشدا قەناعەتم وابوو، بەڵام گوتم ئەمە بەبێ رەزامەندی مەکتەبی سیاسیو بەبێ بوونی بەڵگەیەك ناتوانم جێبەجێ بکەم..چونکە بەئاسانی رایی نابێت. ئەوە بوو رۆژێك بەر لە کۆتایی هاتنی وادەی پەرلەمان، وەفدێکی پارتی بە سەرۆکایەتی کاك نێچیرڤان بارزانی هاتنە سلێمانی، ژمارەیەك لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی تێدا بوون، لەماڵی مام جەلال کۆبووینەوە..ئەوانەی ئامادەبوون لەلایەنی ئێمەوە کاك کۆسرەتو هێرۆخانو د.نجمەددینو بەندەو نازانم کێی تریشمان لەگەڵ بوو..لەگەڵ پارتی لەسەر نوێکردنەوەی وادەی سەرۆکایەت هەرێم بۆ دووساڵو وادەی پەرلەمان بۆ دوو مانگ رێك کەوتین..لەپەراوێزی رێکەوتنەکەش نوسراوە بە تەلەفۆن قسە لەگەڵ مام جەلال کراوەو ئەویش لەسەر نوێکردنەوەکە رازییە..بەڵام رێکەوتنەکە بە کۆمەڵێك مەرج بوو..لەوانە یەکەم ئیشی خولی داهاتووی پەرلەمان کارکردن دەبێت لەسەر دەستوور، سەرۆکی هەرێمیش تەنها ئەو جارە وادەکەی بۆ درێژدەکرێتەوە..هەریەك لە کاك کۆسرەتو کاك نێچیرڤانیش رێککەوتنەکەیان واژۆکردو هەر دەبوا منیش وەك سەرۆکی پەرلەمان جێبەجێی بکەم.

ئەوەبوو وەختەکەی زۆرکەم بوو، منیان راسپارد لەگەڵ پەرلەمانتارانی یەکێتی لە هەولێر کۆبوومەوەو برادەرانی سلێمانیش لەگەڵ پەرلەمانتارانی یەکێتی لە سلێمانی

کۆبوونەوەو رایانسپاردن کە دەنگ بە درێژکردنەوەی وادەی سەرۆکی هەرێم بدەن. لە راستیدا لەڕووی یاساییەوە دەبێ 48 سعات بەسەر پرۆژە یاسایەکەدا بڕوات، بەڵام کارەکەی ئێمە بەو شێوەیە نەبوو..تەنها 13 تا 14 سعات بەسەر پرۆژە یاساکە تێپەڕیبوو..بەڵام ئێمە کۆبووینەوەو ئیتر گۆڕانو کۆمەڵو یەکگرتوو کردیانە هاتو هاوار، بەتایبەت گۆڕان.. ئەوەبوو بتلیان هاویشتو کەلوپەلی هۆڵی کۆبوونەوەیان شکاندو جنێویان پێداینو بەمنیان گوت بەعسی لەتۆ باشترە..ئەو گۆڕانەی ئێستا ئەوەندە نەرمو حەلیمە لەگەڵ پارتی..ئەوسا وایان بەئێمە دەگوتو دەیان قسەی نەشیاویان بە کاك مەسعود بارزانی دەگوت.. قسەیان بەمن دەوتو هاواریان دەکرد بەعسیەك لەئەرسەلان بایز باشترە..چونکە بۆتە هۆی درێژکردنەوەی وادەی سەرۆکی هەرێم. ئەی ئەبێ ئێستا بڵێن چی!؟

***جاری دووەم خۆ هەڵبژاردنەوەت بۆ پەرلەمان چۆن بوو، ئایا بە بڕیاری مەکتەبی سیاسی بوو، یان خۆت داوات کردەوە؟ بەتایبەت کە دەتزانی خەڵکی یەکێتی بەهۆی بڕیاری درێژکردنەوەی سەرۆکایەتی دژت بوون؟**

–راستە، دوای ئەوەی هەڵبژاردنی خولی چوارەمی پەرلەمان هاتە پێش، لەکۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسی لێیان

پرسیم..گوتیان تۆ دەتەوێ خۆت هەڵبژێریەوە. لەراستیدا من مەرامی خۆ هەڵبژاردنەوەم هەبوو، چونکە من کەمتر لە دوو ساڵ سەرۆکی پەرلەمان بووم، حەزم دەکرد وەك هەر سەرۆکێکی دیکە چوار ساڵ، یان شەش ساڵی خۆم لە سەرۆکایەتی تەواو بکەم.

ئەوەی من تێگەیشتمو دواتر کاك بەختیار پێ گوتم، گوایە ئەو ویستویەتی خۆی هەڵبژێرێت، بەڵام لەبەر من باسی نەکرووە؟! نازانم وابێت..بەڵام ئەگەر وا بووبێت، بۆ دوای من کاك مەلا بەختیار رۆژێك لە رۆژان نەهات خۆی بۆ ئەو پۆستە کاندید بکات، بەهەر حاڵ سوپاسی هەڵوێستەکەی دەکەم. ئەوسا پشتیوانی کردم.

بەڵام بەهۆی ئەوەی من وادەی سەرۆکی هەرێمم درێژکردبووەوەو کادیرەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانیش ناڕازیی بوون، قسەی نەشیاویان بەرامبەر کردمو نوێکردنەوەی سەرۆکایەتی کاك مەسعود بارزانی، کاریگەری لەسەر دەنگەکانی من هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر لە بیستو سێ هەزار دەنگم هێنا..

لەلایەکی دیکەشەوە لەناوخۆی یەکێتیو بە تایبەتی لە هەولێر کاك کۆسرەت، دەربازی کوڕی خۆی لەبەرامبەر کاندید کردمو بڕە پارەیەکی زۆریشی بۆ تەرخان کرد تاوەکو رکابەری منی پێبکات.. منیش ئەو ئیمکانیەتەم نەبوو، بەڵام کاك مەلا

بەختیار ماڵی ئاوابێت سەد ملیۆن دیناری بۆناردم.. زۆریش تکام لە کاك عومەر فەتاح کرد لەو برە پارەیەی یەکێتی کە لای بوو، شتێك پارەم بخاتە بەردەست، بەڵام لەجیاتی پارە بۆمن خەرج بکات کە ئەندامی مەکتەبی سیاسیو سەرۆکی پەرلەمان بووم، پارەی بۆ کوڕی کاك کۆسرەت خەرجکرد. ئەوکات گلەییم لێکردو ئیستاش هەر گلەییم لێی هەیە..کاك عومەر فەتاح فلسێکی بەمن نەدا، من بە کولە مەرگیو بەو سەد ملیۆنەو ماڵی هەندێ برادەریش ئاوابێ لە هەندێ شوێن هاوکاریان کردم.. بەو شێوەیە چوومە نێو ململانێی هەڵبژاردنەکەوە.

***ئەی چۆن بوو یەکێتی نەیکردیەوە بە سەرۆکی پەرلەمان، ئایا هیچ ناڕەزایەتیت دەربڕی؟ یان بۆ هەڵویستێت نەنواند؟**

من بەو نیەتە خۆم هەڵبژارد کە دەبمەوە سەرۆکی پەرلەمان، بۆیەش بوومە سەرۆکی لیستەکەی یەکێتی، چونکە بڕیاری مەکتەبی سیاسی وابوو. بەڵام رقەبەرایەتی ماڵی مامۆستا برایم ئەحمەد لەلایەكو هێرۆخانیش لەلایەکی دیکە هەر دژم بوو، چونکە لەچەند وێستگەیەکدا پشتیوانی د.بەرهەمم کردبوو، ئەوە بوو قوبادی کوڕی خۆیان هێنایە پێشەوە، بۆ ئەوەی قوباد ببێتە جێگری سەرۆکی حکومەتی هەرێم.. بەو شێوەیە من نەکرامەوە بە سەرۆکی پەرلەمانو

یەکێتی پۆستی سەرۆکی پەرلەمانی وەرنەگرتەوەو پەرلەمانیان دایە گۆڕان..تەنانەت ئەوکاتەی گۆڕانیش لەحکومەت و پەرلەمان وەدەرنراو د.یوسف و وەزەیرەکانیان دەرکران..ئەوساش ماڵی مامۆستا برایم ئەحمەد بەهاوکاری کاک مەلا بەختیار نەیانهێشت یەکێتی پۆستەکانی جارانی خۆی وەرگرێتەوەو من ببمەوە بە سەرۆکی پەرلەمان.

تاکە هۆکاریش تەنها من بووم.. وایان دەزانی ئەوە منم دەمەوێ بچمەوە شوێنەکەی خۆم. راستە پێم خۆش بوو ببمەوە بە سەرۆکی پەرلەمان. بەڵام خۆ ئەوکاتەی من چوومە خەباتی پێشمەرگایەتی و بووم بە ئەندامی کۆمەڵەو زیندانی کرام بەتەمای ژیانی خۆشم نەبووم.. هەرگیزیش بیرم لەوە نەکردبووەوە پۆست و پلەو پایەم هەبێت. ئەو پۆستانەی لەژیانیشمدا وەرمگرتوون زۆر زۆر لە ویستەکانی من زیاتر بوون. بەڵام ئەو سیاسەتەی ئەوان بەرامبەر بە من رەچاویان کرد، سیاسەتێکی هەڵەبوو.. خودا هەقی منیان لێ بکاتەوە لەو هەموو زوڵمەی لێیانکردم. ئێستاش هەر لەسەر ئەو سیاسەتە هەڵەیە دەڕۆن، هەتا کوڕەکانی مام جەلالیش کە رێزم بۆیان هەیەو وەك برازامن و کوڕی کەسێکی گەورەی وەك مام جەلالن، هەڵەی سیاسیان کردو هەڵەکانیشیان بەچاوی خۆیان دەبینن، بەڵام ئێستا خەریکە دەکەونەسەر رێگای راستی سیاسەت.

***پێتوایە هەر لەبەر درێژکردنەوەی ماوەی سەرۆکایەتی هەرێمە لە میدیاکانی کوردستان زۆرجار خەڵکانێك پێت دەڵێن خوێنت زەردە؟**

–لەراستیدا من نەخوێن زەردەو نەخوێنیشم سەوزە، من خوێنم سوورە ..من لە بنەماڵەیەکی بۆرژوازی بووم..بەناوی رەوتی چەپگەرایی هاتمە نێو سیاسەتو شۆرش، ئەو رێبازەش وایلێکردم ببمە ئەندامی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، تا ئێستاش من بە فیکر چەپم، سوورم، بەڵام بەرەفتار وەکو هەموو لێپرسراوە حیزبیەکانی دیکە، کەسێکی بۆرژوازیم.

سەبارەت بەوەی ئایا من خوێنم زەردە؟ دیارە ئەوانەی چ بە وتارو چ بە قسە لە میدیاکاندا باسی ئەو جۆرە قسانە دەکەن، لەبەر ئەوەیە من دژی شەری براکوژیم..دژی دوو ئیدارەییم، من یەکێکم لەو ئەندامی مەکتەبی سیاسیانەی یەکێتی کە هەمیشە داکۆکی لە تەبایی دەکەمو دژ بەو گرژیانەم کە لەنێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستانو پارتی دیموکراتی کوردستان روودەدەن..چونکە هەمیشە لەوە دەترسم ئەو رووداوانە رامانبکێشێتە نێو ئەوەی خوانەخواستا توشی شەری براکوژی بینەوە..یان هەرێمی کوردستان بەرەو دوو ئیدارییی ببات.

کاتێکیش ئێمە داکۆکی لە تەبایی دەکەین، بێگومان لە قازانجی کۆمەڵێك خەڵك نییە، بۆیە ئەو خەڵکانە ئەو

تێڕوانینەیان هەیەو پڕوپاگەندەم لە دژ دەکەن. من هەموو ژیانی خۆم بە یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەخشیوە، ژیانی خۆم‌و کەس‌وکارم بەشۆڕش‌و کوردایەتی بەخشیوە. ڕێزی زۆرم بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان هەیە..بەڵام من هەر یەکێتیم‌و هەر یەکێتیم‌و تا دوا هەناسەشم هەر یەکێتیم.

***لە هەموو قۆناغەکانی بەرپرسیارێتی حزبی‌و حکومدارێدا، هەمیشە هاوکارو پشتیوان‌و هاندەری گەنجان بوویت بۆ ئەوەی خوێندنیان تەواو بکەن، ئەم هەوڵەتان لەچییەوە سەرچاوە دەگرێت؟**

-ڕاستە، من جگە لەوەی گەنجانی خۆمان هانداون بۆ خوێندن‌و بەدەیان کەسیشن، ژمارەیەکی زۆریشیان خوێندنی زانکۆو خوێندنی باڵایان تەواو کردووە. بەشێکی زۆریشیانم بۆ خوێندنەوەی کتێب‌و خۆ پڕچەککردن بە مەعریفەو کلتوورو ڕۆشنبیری هانداون.

هەمیشە پێم دەگوتن، ئێمەمانان کە ئێستا پۆستی حکومی‌و حیزبیمان بەدەستە، هیچمان لە ئێوە زیاتر نییە، بەڵام کاتی خۆی ئێمە خوێندوومانەو خوێندوومانەتەوەو خۆمان ڕۆشنبیرکردووەو بڕوانامەمان وەرگرتووەو کارو خەباتمان بۆ وڵاتەکەمان کردووە.. ئەگەر ئێوەش لەسەر ئەو ڕێچکەیە بڕۆن ئەوا دەبنە شوێنگرەوەی ئێمە.

بۆیە هەر لەو ڕوانگەیەوە هەندێکیان هاتن و داوای یارمەتیان بۆ تەواوکردنی خوێندنی زانکۆو خوێندنی بالا لێکردووین و ئێمەش بەپێی توانا هاوکاریان بووین. زۆرێك لەو گەنجانە خوێندنی بالایان لە بەیروت و ئۆکرانیاو میسرو ئێران و ولاتانی ئەوروپاو ئەمریکاش تەواو کردووە، ئەمەشم بە ئەرکی سەر شانی خۆم زانیووە کە هاوکاریان بم. چونکە میللەتەکەمان لەشەڕ هەر ئازا بووە، چ لەشەڕی ناوخۆ بەرامبەر یەکتر، چ لەشەڕی دژ بە داگیرکەرانی کوردستان. بەلام ئێستا قۆناغێکی دیکەیەو ولات پێویستی بە زانست و بڕوانامەی بالایە لەهەموو بوارەکاندا..بۆیە پالپشتی و یارمەتیدانی گەنجانمان بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی بالاو فێربوونی زمان و تەکنەلۆژیای دنیا..کارێکە میللەتەکەمان بەرەو پێشەوە دەبات.

***ئەی کێشەتان لەگەڵ "د. محەمەد صابر"ی بەرپرسی کۆمیتەی ڕێکخستنی زانکۆی سەلاحەددین لە سالانی نەوەدەکان چی بوو ؟**

-ڕاستە، ئەوسا لە نۆهەدەکانی سەدەی ڕابردوو، من بەرپرسی مەڵبەندی سێی هەولێر بووم. "کاك محەمەد صابر"یش بەرپرسی کۆمیتەی زانکۆی سەلاحەددینی یەکێتی بوو. جار جارە دەهاتە لام و هەندێ جاریش بە بیست ڕۆژ ون

دەبوو..ڕۆژێك گوتم كاك محەمەد تۆ بەرپرسی كۆمیتەی بۆ جار جار دیاریو وندەبیتو دەوام ناكەی؟

گوتی بۆ تو نازانی من خوێندكارم.

گوتم جا بەچی بزانم!.

گوتی من خوێندكاری دكتۆرام لە زانكۆی موصلۆ لێپرسراوی كۆمیتەشم، خۆشت دەزانی وەزعی موصلّ چەند خراپە، ئەگەر بەعسیەكان بزانن تووشی كێشە دەبمو دەرمدەكەن.

گوتم كەواتە جارێكی دیكە تا خوێندنی دكتۆراكەت تەواو دەكەی لەو مەڵبەندە بتبینم چی خراپە پێت دەكەم..كارەكانی كۆمیتەكەت بەیەكێك بسپێرەو هەر بەرپرسی كۆمیتەش بە..چونكە لێپرسراوی كۆمیتەكە دەمێنی، بەلاّم ئەگەر لەوێ ئاشكرا ببیت دكتۆراكەت لەكیس دەچێت. گوتم ئێمە پێویستمان بە مامۆستای زانكۆو بڕوانامەی بالاّ هەیە.

ئەوەبوو مۆڵەتم پێیدا تاوەكو خوێندنی تەواو كرد..پاشماوەیەك ونبوون، ڕۆژێك هاتەوە لامو زەرفێكی كاغەزی بەدەستەوە بوو، گوتی ئەو نامەیە بۆ تۆ هاتووە.. كە نامەكەم كردەوە بینیم بڕوانامەی دكتۆراكەی بوو..ئیتر پیرۆزباییم لێكردو ئەو لاو ئەولایم ماچ كرد.

***

## مەسەلەی توندبوونی
## تەکەتول لەنێو یەکێتی و چاکسازی

*** سالّی 2004 کاک نەوشیروان وەك جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان چەند کۆبوونەوەیەکی لەگەلّ مەکتەبەکان ئەنجامدان، لەوانەش مەکتەبی رێکخستن..لەو کۆبوونەوەیەدا ناکۆکی کەوتە نێوان بەرێزتان و کاك نەوشیروان هۆکارەکەی چی بوو؟**

–دوای کۆکردنەوەی ئیمزا دژی مام جەلال، مەکتەبی سیاسی بوون بە دوو گروپ، گروپێکیان هی مام جەلال و ئەوەی تریان کاك نەوشیروان سەرکردایەتی دەکردن. من بۆ مێژوو دەلّێم، پێشتر شتێکم بیستبوو، چونکە پەخشان خانی خێزانم پێی گوتم بیستوومە کاك نەوشیروان و کاك کۆسرەت و

کــاك عومـــەری ســـەید عـــەلی بەیەکـــەوە رێککـــەوتوون‌و بەرنامەیەکیان لەبەرامبەر مام جەلال بەدەستەوەیە..من هەر لەسەرەتاوە گاڵتەم پێهات، چونکە ئەوساو ئێستاش پێموابوو بەدرێـژایی تەمـەنی خۆیـان هـەرگیز کـاك نەوشـیروان‌و کـاك کۆسرەت تەبا نـەبوون‌و ناشبن..کاك عومـەری سـەید عـەلیش لەگـەڵ کـاك کۆسـرەت رێـك نـەبوو..دەمزانی هـەر تـەبایی‌و لێکنزیکبوونەوەیەکی ئەوان وەك بلقی سـەرئاو دەبـێ‌و بـاوەڕم نەدەکرد.

رۆژێکیـــان لەکۆبوونـــەوەی مەکتـــەبی سیاســـی بـــووین لـــە "دوکان" بۆ نیوەڕۆکەی چووینەماڵی کاك کۆسـرەت کـە هـەر لەوێ بوو. بەکاك کۆسرەت‌و کـاك عومـەرو کـاك عیمـادم گـوت شـتێکی وام بیسـتووە، ئینشـائەڵلا ئـەو لێـك نزیکبوونـەوەتان خێری پێوەیە..

–گوتیان پێمانخۆشە ئەو قسەیە بـە مـام جـەلال بڵێیـت بـۆ ئەوەی حسابمان بۆ بکات‌و لێمان بترسێت..

–منیش گوتم مـام جـەلال لەکـەس ناترسـێت، بـەڵام ئەگـەر ئێوە بەو هەموو ناکۆکیە پێك بێن خراپ نییەو پێمخۆشە.

ئەوسا من بەرپرسی مەکتەبی رێکخسـتن بووم..بـەرە بـەری نیوەڕۆیـەك مامۆسـتا جـەلال جەوهـەری کـەرکوك کـە ئەوسـا ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسـی‌و بەپرسـی مەڵبەنـدی کـەرکوك بوو..تەلەفۆنی بۆ کردم‌و گوتی: چوومەتە مـاڵی کـاك عومـەری

سەید عەلی بینیومە کاك نەوشیروانو کاك عومەرو کاك کۆسرەتو کاك عیمادو کاك عوسمانی حاجی مەحمودو ژمارەیەکی دیکەی لێبوونو کۆبوونەوەیان هەبوو، پێدەچێت شتێکی ژێر بەژێریان هەبێت..پێم باشە بە مام جەلال بڵێیت..

–منیش گوتم جا بۆ خۆت پێی ناڵێیت، خۆت شتەکانت بەچاوی خۆت بینیوونو ئەندامی مەکتەبی سیاسیشیت واباشترە خۆت پێی بڵێی..

کاتێك مامۆستا جەلال ئەوەی بە مام جەلال گەیاند، شتەکە ئاشکرابوو..من لەو کاتیشدا پەیوەندیم لەگەڵ کاك کۆسرەت هەر مابوو..منو کاك کۆسرەت پیاسەمان دەکرد..دەشمزانی کاك کۆسرەت هەرگیز ئەو رێککەوتنەی تاسەر نابێت، چونکە هیچ بەرنامەو شتێکی ئەو لەگەڵ کاك نەوشیروانو کاك عومەر کۆك نەبوو..جەماعەتی لای کاك کۆسرەت خۆیان پێچابوەوەو لە ئامادەباشیدا بوون..گوتی سەیری ئەمانە بکە وا دەزانن ئەمە ئاخری دنیایەو تێناگەنو وا دەزانن لێك دەدەین.

ئیتر بەشێوەیەکی عەمەلی دوای ئەوە کاك نەوشیروان بوو بە جێگری سکرتێری گشتیو جێگری مام جەلالو بەناوی چاکسازییەوە دەستی بە کۆبوونەوە لەگەڵ مەکتەبەکان کردو دوای چەند مەکتەبێك هاتەسەر مەکتەبی رێکخستنو کۆبوونەوەیان پێکردین، ئامادەبووەکان کاك نەوشیروانو کاك

کۆسرەتو کاك بەرهەمو کاك عومەری سەید عەلی بوون، ئێمەش ستافی مەکتەبی ڕێکخستن بووین..

کاتێك دەستیان بە کۆبوونەوە کرد، هەستمکرد دەیانەوێ لە مام جەلال بدەنو قسەی لەسەر بکەن، منیش گوتم: برادەرینە ئەمە کۆبوونەوەی مەکتەبی ڕێکخستنەو هیچ پەیوەندییەکی بە ناکۆکی نێوان ئێوەو مام جەلالەوە نییە، چونکە ئەگەر ئێوە باسی مام جەلال بکەن من دێمە جوابو قسەم هەیە..بەڵام گوێیان لەقسەکەی من نەگرتوو، وردە وردە باسەکەیان هێنایە سەر بابەتی مام جەلال..منیش جوابم دانەوە.

کاك نەوشیروان رووی لەمن کردو گوتی بۆ وازناهێنی! ؟

-گوتم لەچی وازبێنم؟

-گوتی لە مەکتەبی سیاسی!

گوتم جەنابت ئەمر دەکەی ئێستا وازدێنم..بەڵام تۆ بیست ساڵە ئەندامی مەکتەبی سیاسی هەقە خۆت ئەو ڕێچکەیە بشکێنیو وازبێنیو منیش وازدەێنم..

گوتی جا من وازم هێناوە..

گوتم چۆن وازت هێناوە ئەوە نییە کۆبوونەوەمان پێدەکەی.

گوتی من ئێستا هاوڵاتیم..

گوتم بەڕاستیتە..

-گوتی ئەرێ وەڵلا.

-گوتم برادەرینە هەستن با بڕۆینو ئەوراقەکانمان کۆبکەینەوە، چونکە کابرایەکی هاولاتی ناتوانێ کۆبوونەوە بەکەسێکی مەکتەبی سیاسیو دەزگایەکی گەورەی وەك مەکتەبی رێکخستنی حزبێکی سیاسیی گەورە بکات..

-گوتی نا کاکە دانیشە..بەهەرحاڵ چەند قسەیەکی دیکە کرانو کۆبوونەوەکە تێك چوو..

خوا شاهیدە بەگۆڕی باوکم، بەگۆڕی شەهیدانی کوردستان، تا ئێستاشی لەگەڵ بێت، نە بەقسە، نە بەنامە، نە بەراسپاردە، نە بە تەلەفۆنیش من باسی ئەو کۆبوونەوەیەم بۆ مام جەلال نەکردبوو..نازانم خۆی چۆنی بیستبوو.. رۆژێك مام جەلال تەلەفۆنی بۆکردم..گوتی ئەوە چی بووە لەگەڵ کاك نەوشیروان..گوتم هیچ نەبووە، کۆبوونەوە بووەو قسەی بەرزو نزمیش لەکۆبوونەوەدا هەر دەکرێ..هەر کەسەو قسەی خۆمان کردووە..گوتی نا بە کاك نەوشیروانم گوتووە چیتر کۆبوونەوە لەگەڵ مەکتەبەکان نەکاتو رایانگرێت.

***

# تواندنەوەی کۆمەڵەی رەنجدەران لەناو یەکێتیو
# دواتر جیابوونەوەی بەناوی بزوتنەوەی گۆڕان

***کۆمەڵە داینەمۆی شۆڕشو رێکخراوی هێزو بازووی کۆمەلانی خەلکی کوردستان بوو، بۆ چی لەدوای راپەڕین هەلوەشێنرایەوە؟**

-بیرۆکەی هەڵوەشاندنەوەی باڵەکانی نێو یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بۆ پێش راپەڕین دەگەڕێتەوە. ئەوکاتەی ئێمە لە ئێران بووین، کاك فەرێدون عەبدولقادر وتارێکی لەگۆڤاری "کۆمەڵە" یان "شۆڕشگێڕان" نوسیبوو. لە وتارەکەیدا باسی هەڵوەشاندنەوەو تواندنەوەی رێکخستنەکانی هەرسێ باڵەکەی نێو یەکێتی "کۆمەڵە، شۆڕشگێڕان، خەتی گشتی" کردبوو. داوایکردبوو ئەو رێکخستانانە لەنێو یەکێتی نیشتمانی کوردستان درێژە بە خەباتیان بدەنو وەك یەك حزب کار بکەن..ئەگەر چی ئەو وتارە کێشەیەکی زۆری لەنێو کادیرانی کۆمەڵەدا دروستکرد، بەلام دیاربوو ئەو بۆچوونە

پێشـتر لەلایـەن "مـام جـەلال‌و کـاك نەوشـیروان‌و د.فوئـاد مەعصوم" بەرنامەی بۆ دارێـژرابوو. بەتایبـەتی د.فوئـاد زۆری پێخۆش بوو ئەو کارە بکرێت، چونکە هاوکێشەو تەرازووی هێز لـەنێوان کۆمەڵـەو شۆڕشـگێڕان لـەنێو یـەکێتی نیشـتیمانی کوردسـتاندا، بـەلای کۆمەڵـەدا بـوو، کۆمەڵـە نزیکـەی 85٪ بـۆ 87٪ی یەکێتی پێکدەهێنا.

لەلایـەکی دیکەشـەوە، بیرۆکـەو دەنگۆیـەکی وا لـەنێو کۆمەڵـەدا پەیـدا ببـوو کـەوا ئـیتر قبـوڵی ناکـەن ئەنـدامانی سەرکردایەتی کۆمەڵەو شۆڕشـگێڕان لەسـەرکردایەتی یـەکێتی نیشـتیمانی کوردسـتاندا بەقـەد یـەك بـن. ئەمـەش وایکـرد شۆڕشـگێڕان لەگـەڵ ئـەو ڕایـەدابن کـە هـەموو ڕێکخسـتنەکان یەکبگرن‌و لەژێر چەتری یەکێتیدا خەبات بکەن.

**پ-باسی ڕای "د. فوئاد مەعصوم"تان کرد کە ئەو کات سکرتێری یەکێتی شۆڕشگێڕان بوو، ئەی ڕای کاك نەوشیروان کە سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەران بوو لەوبارەیەوە چی بوو؟**

-کـاك نەوشـیروان لـەبارەی هەڵوەشـاندنەوەی کۆمەڵـە، کۆبوونەوەیـەکی فراوانـی ئەنـدام‌و کـادیران‌و سـەرکردایەتی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی لەهۆڵی میدیای شاری هەولێر ڕێکخست، لەوێدا ئەو بابەتـەی خسـتەڕوو، ڕاوبۆچـوونی زۆری لەسـەردراو هەندێکمان لەگەڵ بووین‌و هەندێکیشمان دژ بووین؟

*** یەکێك لەوانەی دژی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە بوو بەرێزتان بوون، هۆکارەکەی چی بوو؟ ئەوانەی دیکە کێ بوون کە دژ بوون کەسیانت بیرماوە؟**

–ئەوانەی کە دژی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی رەنجدەران بووین و پێمانوابوو هێشتا زەروورەتی رێکخراوێکی چەپ و مارکسی وەك کۆمەڵە لە کوردستان ماوەو بیرم مابێت "کاك جەبار فەرمان و کاك عومەری سەید عەلی و منیش بووم" گوتمان کۆمەڵە رێکخراوێکی چەپی مارکسیستی گەورەیەو بنکەیەکی رێکخستنی پتەوی هەیەو جەماوەرێکی زۆری بەدەورەوەیە، لەکوردستاندا خاوەنی سەنگ و پێگەو قورسایی خۆیەتی، هەق نییە هەڵوەشێتەوە. بەهەرحاڵ ئەو کات بەقسەیان نەکردین و کۆمەڵەیان لەنێو یەکێتیدا هەڵوەشاندنەوەو دۆخەکەش بە ئێستا گەیشت.

***ئایا ئەو پرۆسەیە سەرکەوتوو بوو؟ دواتر هیچ کێشەیەکی لێ پەیدا نەبوو؟**

–جا سەیرەکە لەوەدایە، چەند ساڵێك دوای هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەو تێکەڵاوبوونی رێکخستنی هەموو باڵەکان و بوونیان بە رێکخستنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، نازانم کاك نەوشیروان بەچ هۆکارێك لە مام جەلال تورە ببوو،

لەهەمان هۆڵی میدیای شاری هەولێر کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ کادیرە کۆنەکانی کۆمەڵە کردەوەو گوتی پێویستە کۆمەڵە زیندوو بکەینەوە. ئەوجارەشیان من هەر دژی بۆچوونەکەی کاک نەوشیروان بووم! لە کۆبوونەوەکەدا بەدوو دارشەقەوە هەڵسامەوەو گوتم..تۆ کۆمەڵەت هەڵوەشاندنەوەو مراندت، شتی مردوو چۆن زیندوو دەبێتەوە..پێشتر زۆر هاوارمانکرد کە هەڵینەوەشێنیەوە.. هەر هەڵتوەشاندنەوە. لەو کاتەوە ئیتر کاک نەوشیروان وردە وردە لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەنهێنی ئیشی کرد، تا ئەو کاتەی بزوتنەوەی گۆڕانی دروستکردو جیابووەوە.

*** پێتانوایە لەکاتێکدا رەوتی چەپ ڕوو لە کۆتایی بوو لە دنیادا، مانەوەی کۆمەڵە زەروور بوو بێت، تا ئێوە دژی هەڵوەساندنەوەی بن؟**

–راستە گۆڕانکاری گەورە لە دنیا روویاندابوو، بەلام زەروورەتی کۆمەڵە بۆ نەمابوو؟ پێماوایە زەروورەتی مابوو. کۆمەڵە هیچ کێشەیەکی نەبوو، بەلام کاک نەوشیروان خۆی باوەڕی بە چەپو مارکسیزم نەمابوو! . لەچەندین کۆبوونەوەو کۆنفرانسی کۆمەڵەشدا لە شاخ دەیگوت مارکسیەت لە دنیادا گەڕو گول بووە. لە کۆنفرانسی دووەمی کۆمەڵەش هەمان ئەو قسەیەی کرد، جگە لەمەش لە نوسینو کتێبەکانی خۆیدا

بەروونی باسی ئەوە دەکات و دەڵێ چەندین ساڵ سکرتێری کۆمەڵە بووم، بەڵام باوەڕم بە چەپ و مارکسیەت نەبوو..کاک نەوشیروان خۆی لەخوای دەویست کۆمەڵەی لەکۆڵ بێتەوە. پاساوێکی دیکەشی دۆزیبووەوە دەیگوت من لە داخی ئێوەی سەرکردایەتی کۆمەڵە، کۆمەڵەم هەڵوەشاندەوە، چونکە ئێوە بەکەڵکی سەرکردایەتی نەدەهاتن.

***ئەی کاتێک کاک نەوشیروان گۆڕانی دروستکردو لە یەکێتی جیابووەوە هەمان ئەو سەرکردایەتیە نەبوون کاری لەگەڵی بوون؟**

–وایە کە بزوتنەوەی گۆڕانی دروست کردو لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان جیابوەوە، دیسان هەمان پاساوو بیانوی هێنایەوەو دەیگوت من لەگەڵ ئەو سەرکردایەتیەی یەکێتی ناگونجێم..ئەوانە بە کەڵکی سەرکردایەتی و ئیشکردن نایەن..کەچی کە بزوتنەوەی گۆڕانی دروستکرد بەشی هەر زۆری سەرکردایەتی گۆڕان، کۆن سەرکردایەتی یەکێتی بوون و کۆمەڵەش بوون و زۆر بە ئاسایش کاک نەوشیروان ئیشی لەگەڵ دەکردن.

## راستی رێککەوتنی دەباشان لەنێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستان و بزوتنەوەی گۆڕان

*** رێککەوتنی دەباشانی نێوان یەکێتی و گۆڕان چۆن رێککەوتنێك بوو، یان بابڵێین لەنێوان مام جەلال و کاك نەوشیروان چی باس کرابوو..هیچ دەستنووسێکی ئەو رێککەوتنە بوونی هەیە؟ ئەگەر نییە بۆ ئەوەندە باسی لێوە دەکرێت؟**

–دەربارەی رێکەوتنی دەباشان.. راستی من لەدانیشتنەکە نەبووم و هیچ دەستنوسێکم نەبینیووەو نازانم چی بووەو چی تێدابووە.

ئەو کاتە من سەرۆکی پەرلەمان بووم، رۆژێك مام جەلال تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی سەرێکم لێ بدە..چوومە لای لە سلێمانی.

– گوتی لەگەڵ کاك نەوشیروان هەندێ رێککەوتنمان کردووە بچۆ سەرێکی لێبدە.. هیچ قسەیەکی دیکەی لەگەڵ نەکردم و باسی ناوەڕۆکی رێککەوتنەکەشی نەکرد. مام جەلال هەر خۆشی مەوعیدەکەی لەگەڵ کاك نەوشیروان بۆ وەرگرتم.

چـوومە لای کـاك نەوشـیروان، خـوا هـەڵناگری زۆر ریـزی لێگرتمو پێشوازی کردم..هەر دەیگوت ئێ سەرۆکی پەرلـەمانو دکتۆرو..بەوشـێوەیە قسـەی دەکرد..دواتـر گـوتی ئێمـە ئیشێکمان بەتۆیەو بزانین چیمان بۆ دەکەی، گوتم چ ئیشێکە.. گوتی یەکێتیو گۆڕان رێککەوتووین بۆ ئەوەی دژایـەتی پـارتی بکەینو چەند قسەیەکی بەرزو نزمیشی بە پارتی گوت.

منیش گوتم..تـۆ چـی دەڵێی..ئـەی ئێمـە شـەڕی پارتیمـان نەکرد، ئەوان شەڕی ئێمەیان نـەکرد؟ ئـەی هـەموو دەوڵـەتانی ئیقلیمی دەستیان نەخستەنێو ئەو ململانێیەو هێـزی ولاتانمـان نەهێنایە سەر یەکترو نەیانهێشت هیچ لایەکمان بەسەر ئەویتردا بالادەسـتبین..ئەی ئێمـەو پـارتی هـەموو هێـزی خۆمـان بـۆ لـەناوبردنو رەشـکردنەوەی یـەکتر تـاقی نـەکردەوە..ئینجا سەرباری ئەمەش نە مام جەلال قسەی وای لەگەڵ من کردووەو نە سیاسەتی یەکێتیش لە مەکتەبی سیاسی وا بەرامبەر پـارتی باسکراوەو نە خۆشم باوەڕم بەو مەسەلەیە هەیە.. دوای چـەند ساڵ شەڕکردنمان لەگەڵ پارتی ئێستا ئێمەو ئێوە رێك بکەوین بۆ ئەوەی جارێکی دیکە شەڕی پـارتی بکەینـەوە. گـوتم ئەمـە بەڕای من کارێکی خراپەو واشم پێنـەگوتراوە تـا ئـەوە بکـەمو ئەمە سیاسەتی یـەکێتی نییـە. دیـاربوو لـە قسـەکانم نارحـەت بوو..گوتی کەواتە ئیشمان بۆ ناکەیو هاوکاریمان ناکەیت..بـە کورتی من لەوە تێگەیشتم ئەوەی لەخولی دواتری پەرلەمان بـە

"د.یوسف محەمەد"ی کرد، دەیویست بەمنی بکات..بەڵام مـن نەچوومە ژێرباری ئەو کارەی کە بەهیچ شێوەیەك خۆم باوەڕم پـێ نـەبوو. بەهـەرحاڵ دوای سـعاتێك مانـەوە، دانیشـتنەکە بەنارحەتی ئەو تەواو بوو.

بۆ بەیانییەکەی چوومەوە لای مام جەلالو هەمان قسـەکانم بـۆ مـام جـەلال باسـکرد..مام جـەلال گـوتی چـۆن؟! وای پـێ گوتی؟..گوتم..بەڵێ.

ئیدی مام جـەلال گـوتی بـۆ مێـژوو پێـت دەڵـێم مـن لەگـەڵ گۆڕانو کاك نەوشیروان رێـك نەکـەوتوومو رێکـیش ناکـەوم بـۆ شەڕی پارتـیو جارێکی دیکە شەڕی کوردکوژی ناکەمەوە.

گوتـی من دەمەوێ ئێمەو پارتـیو گۆڕان بەیەکەوە ئیـدارەی ئەم وڵاتە بدەینو وڵاتەکـەمان چـیتر بەرگـەی شـەڕو نـاکۆکیو مـاڵوێرانیو بەکوشـتدانی کـوڕی فـەقیرو هـەژار ناگرێـتو بـرۆ ئیشو کاری خۆت بکەو جـارێکی دیکـەش نەچیتەوە لای کـاك نەوشیروان.




ئەرسەلان بایز، هێرۆخان



عەلی بچکۆڵ، عومەری سەید عەلی، ئەرسەلان بایز، مام جەلال، ئاسۆی شێخ نوری، شەهید عەبدولرەزاق، جەبار فەرمانی رەحمەتی.



د. فوئاد مەعصوم، د.سالار باسیرە، د.ئەرسەلان بایز



د.ئەرسەلان بایز، کاک کوسرەت رەسوڵ، .....



د.ئەرسەلان بایز، جەبار فەرمان،.........



شەهید شاخەوان عەباس، شیخ دارای حەفید، فەرێدون عەبدولقادر، د.ئەرسەلان بایز



د.ئەرسەلان بایز، مستەفای سەید قادر، عوسمانی حاجی مەحمود، بەکر مستەفا



دلێری پارتی گەل، فەلەکەدین کاکەیی، قادر جەباری، فەرەنسۆ حەریری
جەبار فەرمان، ئەبو حیکمەت، ئەرسەلان بایز-سەردەمی بەرەی کوردستانی



شەهید شاخەوان، شەهید حەسەن کوێستانی، ئەرسەلان بایز



د.ئەرسەلان بایزو چەند پێشمەرکەو فەرماندەیەك



پەخشان خانی حەفید، شەهید شاخەوان عەباس، ئەرسەلان بایز



شەهید شاخەوان، شەهید عەلی سالّح، ئەرسەلان بایز



ئەرسەلان بایز، فاروقی عەلی مەولود، ئەنوەر حەسەن، شەهید مامۆستا کاوە



د.ئەرسەلان بایز، د.فوئاد معصوم، ملازم عومەر عەبدوللا



جەبار فەرمان، ئەرسەلان بایز



مامۆستا بەکر، کاکە عەبە، ئەرسەلان بایز، ملازم خولە



شێخ جەعفەر، عوسمانی حاجی مەحمود، ئەرسەلان بایز



سولتان دێهاتی،.........، عومەری سەید عەلی، ئەرسەلان بایز



ئەرسەلان بایز لەگەل کۆمەڵێك سەرکردەو فەرماندەو پێشمەرگە



سەبیحەخان، جەبار فەرمان، ئەرسەلان بایز، پەخشان خان



ئەرسەلان بایز، سەعدون فەیلی



ناسراوەکان: حاجی برایم بایز، خالد جوتیار، ئەرسەلان بایز، کاکە عەبە-

سەردەمی خوێندکاری



جەنابی مام جەلال، د.کەمال خۆشناو، ئەرسەلان بایز

ئاهەنگی نەوروز- سورداش 1984






جەبار فەرمان، ئەرسەلان بایز، کۆنفرانسی سێیەمی کۆمەڵەی رەنجدەران



ئەرسەلان بایز، جەبار فەرمان-1984-سورداش



ئەرسەلان بایزو پێشمەرگەیەك



حەمەی عەتیە-خەڵکی سلێمانی‌و ئەرسەلان بایز



تیپی مۆسیقای شەهید کارزان، ناسراوەکان:

ئاراس ئیبراهیم، مامۆستا مەجید، ئەرسەلان بایز



ئەرسەلان بایز، عەلی بەگ بایز، برایم بایز، دەهامی رەحمەتی



پەخشان خانی حەفید، هاوڕێ روناك، ئەگنیتا، فاتمە خان
عومەرشێخ موس، مەلا بەختیار، ئەرسەلان بایز، شێخ عەلی



ئەرسەلان بایز



کاک نەوشیروان مستەفا سەرۆکی بزوتنەوەی گۆڕان، د.ئەرسەلان بایز سەرۆکی پەرلەمان، گفتوگۆ لەبارەی رێککەوتنی دەباشان



عەدنان موفتی، کاک کوسرەت رەسوڵ، ئەرسەلان بایز، سەعدی ئەحمەدپیرە سەردانی کەسایەتی سیاسی هاوڕێ عەزیز محەمەد



د. بەرهەم سالح، د.ئەرسەلان بایز، مام جەلال، مام یاسین گەلالی



سەعدون فەیلی، جەبار فەرمان، ئەرسەلان بایز



د.ئەرسەلان بایز، کاك کۆسرەت رەسولّ جێگری سکرتێری گشتی "ی.ن.ك"




پەخشان زەنگەنە- سکرتێری خانمانی کوردستان ، د.ئەرسەلان بایز-سەرۆکی پەرلەمان، کاوەمحمود-سکرتێری حزبی شیوعی کوردستان



عومەری سەید عەلی، حەمە تۆفیق رەحیم، سالار عەزیز،
جەلال جەوهەر، عیماد ئەحمەد، کاک کوسرەت رەسوڵ، د.فوئاد معصوم،
جەنابی مام جەلال
کاک نەوشیروان، عومەر فەتاح، د.ئەرسەلان بایز،
د.بەرهەم سالح، عوسمانی حاجی مەحمود،
قادری حاجی عەلی، ملازم عومەر عەبدوڵلا



مام جەلال، د.ئەرسەلان بایز، کاك کۆسرەت رەسول، جەمال ئاغا، خەلیل دۆسکی



د.ئەرسەلان بایز، د.بەرهەم ساڵح، د.ئارام محەمەد قادر



عومەری سەید عەلی، جەبار فەرمان، ئەرسەلان بایز، سۆران،.......



مستەفا سەید قادر، ئەبوبەکر خۆشناوی رەحمەتی،

ئەرسەلان بایز، بەهرۆز گەلاڵی..............



م.رێبوار، ئەبوبەکر خۆشناو، بێستون خدر، حەمە چاوشین، ئەرسەلان بایز، مام جەلال،
عومەری سەید عەلی، شێروان شێروەندی، جەمال یوسف، ئاسۆ عەلی، محسن عەلی ئەکبەر



ئەرسەلان بایز- لەسەردەمی فەرمانبەریدا



د.ئەرسەلان بایز سەرۆکی پەرلەمانو فازڵ میرانی، سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان




د.کەمال کەرکوکی سەرۆکی پەرلەمان، د.ئەرسەلان بایز جێگری سەرۆکی پەرلەمان



سیداد بارزانی، عیماد ئەحمەد، کاك مەسعود بارزانی، کاك کۆسرەت، د.ئەرسەلان بایز-کۆبونەوەی شاندی "ی.ن.ك" لەگەڵ سەرۆکی "پ.د.ك".



سەرۆکایەتی پەرلەمان"د.ئەرسەلان بایز، د.حەسەن محەمەد سوورە، کاك فرسەت ئەحمەد"، فازڵ میرانی سکرتێری"پ.د.ك".



سەرۆکایەتی پەرلەمان"د.ئەرسەلان بایز، د.حەسەن محەمەد سوورە، کاک فرسەت ئەحمەد"، شاندی حکومەت"کاک نێچیرڤان بارزانی، سەعد خالد، سەفین دزەیی"



کۆبوونەوەی سەرۆکایەتی پەرلەمان"د.ئەرسەلان بایز، د.حەسەن محەمەد سوورە، فرسەت ئەحمەد"و سەرۆکایەتی حکومەت" نێچیرڤان بارزانی، عیماد ئەحمەد، سەعد خالد"



د.فوئاد حسێن، کونسوڵی ئەمریکا، کاك مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێم، د.ئەرسەلان بایز سەرۆکی پەرلەمان، فازڵ میرانی سکرتێری"پ.د.ك"، حەمەی حاجی مەحمود- سکرتێری حزبی سۆسیالیست، فەلاح مستەفا. رۆژی نیشتمانی ئەمریکا-هەولێر



د.ئەرسەلان بایز، م.بەکر مستەفا، بورهان سەعید سۆفی، .هاوڕێ زیرەك کەمال پرسەی "جەنابی مام جەلال"



کاك مەلا بەختیار، د.ئەرسەلان بایز، سەعدی ئەحمەد پیرە



......، سەفین مەلاقەرە، ئەرسەلان بایز



ئەرسەلان بایز، هیوا خانەقینی-سەردەمی خوێندکاری





ڕۆژی سوێندخواردنی د.ئەرسەلان بایز، وەك سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان





کاک کۆسرەت رەسول، د.ئەرسەلان بایز، رزگار عەبدولقادر



ئەرسەلان بایز، ئاسۆ شیخ نوری، فەرێدون عەبدولقادر، پاکیزەخان، پەخشانخانی حەفید



سەردانی سەرۆکی حکومەتی هەرێم بۆ پەرلەمانی کوردستان



د.ئەرسەلان بایز-سەرۆکی پەرلەمان، کونسوڵی ئەڵمانیا لە هەرێمی کوردستان



پێشوازی سەرۆکی سەرۆکایەتی پەرلەمان لە کونسوڵی ئەمریکا لەهەرێمی کوردستان



پێشوازی سەرۆکایەتی پەرلەمان لە "لویس ئایالا" سکرتێری سۆسیال ئەنتەرناسیۆنال



د.ئەرسەلان بایز لەگەڵ سەرۆکایەتی پەرلەمانو پەرلەمانتاران و فەرمانبەرانی دیوان
کردنەوەی هۆڵی نوێی کۆبوونەوەکانی پەرلەمانی کوردستان





د. کەمال فوئاد، د. ئەرسەلان بایز- سەردانی کۆماری میللی چین



مەلابەختیار، ئەرسەلان بایز، د.کەمال فوئاد –سەردانی کۆماری میللی چین



د.ئەرسەلان بایز، ئازاد رۆستەم، جەنگی، مەحمود کەشکۆڵ، مەهداوی پیرە، د.ئارام، د.دلێر، م.ئیبراهیم، ئیسماعیل کوردە، شەماڵ، رزگار عەبدولقادر، ئازاد سادق، کاروان محەمەد، ئازاد چاوشین، د.سامی عەزیز



د. ئەرسەلان بایز، د.سامی عەزیز، ئیسماعیل کوردە، ئازاد چاوشین



د.ئەرسەلان بایز، قوباد تاڵەبانی،

ئازاد چاوشین، ئیسماعیل کوردە، ئازاد ڕۆستەم



ئەرمین خان، شێخ دارۆ، حەمە تۆفیق ڕەحیم، ملازم عومەر، عومەر فەتاح، بەهرۆز گەلاڵی،

عادل موراد، د.لالە، سەبیحەخان، جەبار فەرمان، هێرۆخان، ئیڤان، پەخشانخان، ئەرسەلان بایز



بایز ئاغا دزەیی‌و مەحمود ئاغای دزەیی



ئەرسەلان بایز لە ساڵی 1969



د.ئەرسەلان بایز، د.شیرین فاتح



هاوێرو پەخشانخانی حەفیدو د.ئەرسەلان بایز-1984



د.فوئاد معصوم، د.نجمەددین کەریم، زەعیم عەلی، د.ئەرسەلان بایز، د.ڕۆژ شاویس،
جەنابی مام جەلال تاڵەبانی، کاک مەسعود بارزانی، د.ئەحمەد چەلەبی



د.ئەرسەلان بایزو دەستەی پێشمەرگەکانی
"رزگار عەبدولقادر، فەخرەدین، هێرش، ئیدریس، ستار، رێباز، هاشم"



د.ئەرسەلان بایز
ئیسماعیل کوردە

کۆنووس

هەردوو مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی
کوردستان بە سەرپەرشتی هەڤاڵان کۆسرەت رەسوڵ، جێگری یەکەمی
سکرتێری گشتی یەکێتی و نێچیرڤان بارزانی، جێگری سەرۆکی پارتی،
ڕۆژی پێنج شەممە ٢٩/٦/٢٠١٢ لە بارەگاکەی مام جەلال لە سلێمانی
کۆبوونەوە بە مەبەستی یەکلاکردنەوە و بڕیار لێدان لە مەسەلەی
درێژکردنەوەی ماوەی پەرلەمان و سەرۆکایەتی هەرێم.
دوای وتووێژ و ڕاگۆڕینەوە بڕیار لەسەر چەند خاڵێ خوارەوە
درا:

١. ماوەی کاری پەرلەمان تا ١/١١/٢٠١٢ درێژ بکرێتەوە و
هەڵبژاردنیش لە وادەی خۆی ٢١/٩/٢٠١٣ ئەنجام بدرێت.

٢. ماوەی سەرۆکایەتی هەرێم بۆ ماوەیەک درێژ بکرێتەوە کە لە
دوو ساڵ زیاتر نەبێت و قابیلی دووبارە درێژکردنەوەی نەبێت
لەو ماوەیەشدا پڕۆژەی دەستووری هەرێم بە سازان
هەموار بکرێتەوە.

٣. پێداچوونەوە بە ڕێککەوتننامەی ستراتیژی بە ئاماری توندوتۆڵ
کردنی و، حوکمڕانی کوردستان بە شەراکەتی هەردوولا بەڕێوە
بچێت.

شیاوی باسە، بە ناچاری مام جەلال بە تەلەفۆن ڕەزامەندی نیشان
داوە لەسەر درێژکردنەوەی ماوەی سەرۆکایەتی هەرێم بەو
شێوەیەی لەم کۆنووسەدا هاتووە.

کۆسرەت
٢٩/٦

نێچیرڤان

کۆنوسی ڕێککەوتنی "ی.ن.ك" و "پ.د.ك" لەبارەی درێژکردنەوەی وادەی سەرۆکایەتی هەرێم بۆ "کاك مەسعود بارزانی".



( بغداد )

عدد الدعوى : ٣٢٤/ج/ ١٩٧٦

التاريخ : ١٩٧٦/٧/١١

قرار الحكم

تشكلت محكمة الثورة بتاريخ ١٩٧٦/٧/١١ برئاسة الحاكم السيد جار الله ايوب العلاف وعضوية العميد الحقوقي راغب فخري والمقدم الحقوقي اسامه امين واصدرت باسم الشعب القرار الآتي :-

١- الحكم على كل من انور زوراب احمد وشهاب نوري صالح وجعفر عبد الواحد احمد بالإعدام شنقا حتى الموت وفق الفقره أ من الماده ٢٠٤/١٧٥ من ق ع .

٢- الحكم على كل من فريدون قادر رفيق وارسلان بايز اسماعيل وزكي آزات عبد الغفور ومرعان حسين وعلي محمد قادر ونشنشند سعيد عباس وسلام محمد حسن بيرزو وابراهيم حسين عبد الله ودارا نوري صالح وعبد الجبار فرحان علي اكبر وعبد الله علي رشيد وسعد عبد الله حلمي وخضير عبد الرحمن محمد وكمال علي محمود وعثمان أحمد نصر الله وحسين رضا رضا وفاروق أحمد عبد الله وانور حسن خضير وانسو نوري رضا وعلي حمه مراد بالسجن لمدة ستة سنوات وفق الفقره أ من الماده ٢٠٤ من ق ع بدلالة الفقره ١ من الماده ١٧٥ من ق ع على ان تحتسب لهم موقوفيتهم .

٣- مصادرة اموال المحكومين في ١ و ٢ اعلاه المنقولة وغير المنقولة ومصادرة المسدس والعتاد

٤- اعتبار جريمة المحكومين في ١ و ٢ جناية ماسة بالشرف حسب احكام قانون رد الاعتبار المرقم ٣ لسنة ١٩٦٧ المعدل .

قرارا صدر باتفاق الآراء وافهم علنيا في ١٩٧٦/٧/١١ .

| المقدم الحقوقي | العميد الحقوقي | الحاكم |
|---|---|---|
| اسامه امين | راغب فخري | جار الله ايوب العلاف |
| عضو | عضو | رئيس محكمة الثورة |

بڕیاری لە سێدارەدانی خەڵەشەهاب‌و هاورێکانی لە بڕگەی"1"و زیندانیکردنی د.ئەرسەلان بایزو هەموو ئەوانەی ناویان هاتووە بۆ ماوەی شەش ساڵ لە بڕگەی "2".



(( سري للغايه ))

بسم الله الرحمن الرحيم

الامن العامه

مديرية امن محافظة السليمانيــــــه

الجمهوريه العراقيه

//الجنائيــه //

العدد /

التاريخ / /١/١٩٧٦

الى / محافظة السليمانيه ــ الاداره العامه ــ مديرية التحرير والجنسيه

الموضــوع/ تسليم عراقيين

كتابكم ٢٥ لــــــــــ ٧/١/١٩٧٦.

بتاريخ ١/١/٩٧٦ سلمت السلطات الايرانية الى مخفر بناوه سوته الحدودي التابع لقضاء بنجوين العراقيين كل من ١- شهاب شيخ نوري صالح شقلة مدقق في تنفيذ تبغ السليمانيه ٢- عمر سيد علي معلم في السليمانيه مدرسة هياس ٣- زكي اوات عبد الغفور حسين معاون ملاحظ فني في المياه الجوفيه في السليمانيه ٤- جعفر عبد الواحد احمد مدرس في متوسطة الجمهوريه محافظة اربيل ٥- ارسلان بايز اسماعيل معاون ملاحظ في الشركة العامه الدواجن في اربيل ٦- علي محمد قادر معاون سائق مكائن في كهرباء جم جمال ٧- فريدون قادر علي ملاحظ حقوق في بلدية الرابادي هم موضوع بحث كتاب شرطة السليمانيه المشار اليه بكتابكم اعلاه علما ان المذكورين صدرت بحقهم امر القبض قبل هروبهم. وان اسباب تسليم المذكورين الى السلطات العراقيه من قبل السلطات الايرانيه يعود الى انهم ادعو بانهم دخلوا ايران لزيارة اقاربهم واعادتهم الى العراق بتاريخ ٨/١/٩٧٦ احيلوا الى مديرية امن محافظة بغداد ش٦ حسب طلبها ببرقيتها ٣٤٦ في ٥/١/٩٧٦ كونهم يعملون في تنظيمات حزب الماركسي اللينيني الكردستاني بموجب كتابنا سري للغايه ١٤٢ في ٨/١/٩٧٦ للتفضل بالاطلاع رجاءا.

رائد الامن

مدير امن محافظة السليمانيــــه

نوسراوی رادەستکردنەوەی خاڵەشەهابو جەعفەر عەبدولواحیدو عومەری سەید عەلیو فەرێدون عەبدولقادرو ئەرسەلان بایزو ئاوات عەبولغەفورو عەلی محەمەدقادر بچکوڵ، لەلایەن ئێرانەوە بە عێراق.